بەشی سێ

# بژاردە

گوڵبژێرێکە لە فەرموودەکانی

## صحیح جامع الصغیر وزیادته

سیوطی نەبهانی ئەلبانی

بەگوێرەی بابەتە فقهی‌یەکان رێکخراون

لەگەڵ کورتە شەرحێکی (شێخی موناوی)

باوکی عبدالله

هەڵی بژاردون و کردونی بەکوردی

چاپی یەکەم

بەشی سێیەم

# بـــژاردە

گوڵبژێرێکە لە فەرموودەکانی

# صحیح جامع الصغیر وزیادته

سیوطی نەبهانی ئەلبانی

بەگوێرەی بابەتە فقهی‌یەکان رێکخراون

لەگەڵ کورتە شەرحێکی (شێخی موناوی)


باوکی عبدالله

هەڵی بژاردون و کردونی بەکوردی



چاپی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب : بژارده

ناوی وەرگێر : باوکی عبد الله (ئومێد محمد)

تیراژ : ٥٠٠ دانه

لەبڵاو کراوەی : کتێبخانەی ئاراک

ژمارەی سپاردن : ٢٣١ی ساڵی ١٩٩٨

# پێشەکی

لە خوای گەورە داواکارم کە یارمەتی گشت لایەکمان بدا بەندە بۆ ئامادەکردن و ئێوەش بۆ خوێندنی و لەبەرکردنیان ئەمجارەشیان دوا بەدوای بەشی دووەم بەشی سێهەم بە شێوازێکی‌تر خوا یاربێ پێتان شاد دەبێ وەکو براکانی سەر بەماڵەکانتاندا دەکاو کەلێنێکی بچوکی تر لە کتێبخانەکەتان پڕ دەکاتەوە ، خوازیاری ئەوەم کە ئەمجارەیان ئەو گرێ و گۆڵانە نەهێڵێ لە دەرەوونی گشت لایەکدا بە ڕوونکردنەوەی زیاتر سەبارەت بەو فەرمودانە ئەوەش بە لەبەرچاو گرتنی ئامۆژکاری گەلێك برای بەڕێزو ئازیزو یارمەتیان ، لەخوا بەزیادبێ لەڕێی برایەکی خۆشەویستەوە (فیضل القدیر)ی شەرحی (الجامع الصغیر)م پێ گەیشت کە شێخی موناوی کردوویەتی ، بەمەش پڕۆژەکە کامڵ ترو دەوڵەمەندتر دەبێ ، هەرچەندە لەشەرحەکەی موناوی‌دا زۆر شتی بەدرێژەی هێناوە ، بەڵام من بە کورتی و بە گوێرەی پێویست لێیم هەڵگۆزەزیوە و لە خوار فەرمودەکاندا هێناومە و سودم لە هەندێك سەرچاوەی تریش وەرگتروە و هەریەکەش لە شوێنی خۆیاندا باسکراون وناویان براوە ، هاوکات لەگەڵ ئەو شەرحەدا ژمارەی فەرمودەکانی (صحیح الجامع الصغیر)ەکە نوسراوە ، بە نموونە فەرمودەی ژمارە (٢٠٦)کە بەدوایدا ژمارە (١٥٨١)کە هی (صحیح الجامع)ە و بەدوائەویشدا ژمارە (٧١٠)هی زیادەکەیە ، دیارە کە ژمارەی یەکەمیش هی بژاردەکەیە .

خۆشەویستانم : بەر لەوەی ئەم جارەش ماڵ ئاوایتان لێبکەم بە جێتان بهێڵم ، دەمەوێ ئەوەتان عەرز بکەم کە (بژاردە)پڕۆژەیەکەو هەرکەسێك دەیەوێ دەوڵەمەندی بکات و بەژدار بێ لەبەرەوپێش بردنی ئەوا دەرگائاوەڵایە لە ڕووی هەمو ئەوانەی کە مەبەستیانە .

سەبارەت بە بەشی یەکەم و دووەمیش خوا پشتیوان بێ لە ئایندەدا و لەچاپی دووەمدا وێڕای شەرحەکەی موناوی هەرچی پێویست بێ لە زیادە و خستنەسەری درێغی ناکەین ، ئەو خزمەتە بەوان و سەرجەم بەشەکانی تریش دەکەین .

لە کۆتایشدا لەخوای پەروەدگار دەپاڕێمەوەکە لێمی قبوڵ بکات و بواری ئەوەم بۆ بڕەخسێنێ کە بەشەکانی تریش بخەمە بەردەستان و ئێوەش بەهرەمەندبن لێیان. ١٠ ذي القعدة ١٤٢٠ك

**برای بچوك و خزمەتکارتان**
**ئومێد محمد**

# ٤١- گرنگی و گەورەیی مزگەوت

## (٢٠٣) – (٦٧٠٢) –((المَسجِدُ بيتُ كلِّ مؤمنٍ)) .

(حسن) (حل)عن سليمان الصحيحه :٧١٦: القضاعي

### ماناى فەرمودەکە

(٢٠٣)– (٦٧٠٢)– ((مزگەوت ماڵی هەمو بڕوادارێکە))

(حەسەنە) (حل)لە سولیمانەوە ڕیوایەتی کردووە صەحیحە :٧١٦: قوضاعی.

مونـاوی فەرمویـەتی :– لـه ڕیوایەتێکدا هاتووه کە ماڵی هەمو لە خوا ترسێکە (کل تقی)، طەبەرانی ووتویەتی : ئەم فەرمودەیە ئاماژەیە بۆئەوەی کە مانەوە لە مزگەوت و سود وەرگرتـن پـێی شتێکی چاك و گونجاوە ، لەوەی کەڕێ پێدراوە لـە خـواردن و خواردنەوە و نوستن و هاوشێوەی ئەمانە ، ئەو کارانەن کە ناتوانرێ ڕێ گیریان لێ بکرێت ، کە لـه مزگەوتدا بکرێن . (المهلب)ووتویەتی :ئەم فەرمودەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە فـەقیر دەتوانـێ مـاڵی لـە مزگـەوتدا بـێ ، (زیـن العراقـی)یـش ووتویـەتی : ڕووکـاری فەرمودەکە ئەوەیە کە (ئیماندار)تێیدا بمێنێتەوە بۆ ئیعتکاف و نوێژ و خوێندنی قورئان و ئـەو بابەتانـەی کـە مزگـەوتیان بـۆ بنیـات نـراوە ، هـەندێکیش وتویانـە : شـوێنی پارێزکاران (المتقین)ی ئوممەتی ئیسلامە ، بەو مەرجەی کە شتێکی تێدا نەوترێ کە پێچەوانەی ئەو شتە بێ کە مزگەوتی بۆ بنیاتنراوە ، واتە قسەی دونیای تێدا نەکرێ ، پیاوچاکانی پێشوو قسەی ڕێ پێدراو (مباح)یشیان لە مزگەوتدا نەکردووە.

## (٢٠٤)–(١٦٧)– ((أَحَبُّ البلاد إلى الله مساجدها و أبغَضُ البلاد إلى الله أسواقها)).

صحيح (م)عن ابى هريره،(حم،ك)عن جبير بن مطعم مختصر مسلم ٢٤١ ، المشكاة ٦٩٦.

### ماناى فەرمودەکە

(٢٠٤)–(١٦٧)– ((خۆشەویسـترین شـوێنەکان بـەلای خـواوە لـە ئاوەدانیـاندا مزگەوتـەکانن ، وە ڕق لێبوەتریـن شـوێنەکانی بـەلای خـواوە لـە ئاوەدانیـاندا بازاڕەکانن)).

(صحیحـە)(م)لـە ئـەبو هورەیـرەوە ، (حـم ،ك)لـە جوبـەیری کـوری موطعیمـەوە ، ڕیوایـەتیان کردووە ، موختەصەری موسلم ٢٤١، میشکات٦٩٦.

مونـاوی فەرمویـەتی :خۆشەویسترین شوێن بەلای خواوە مزگەوتـەکانن، لەبەرئـەوەی وشوێنی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو ، بنچینەی پارێزگاری (تقـوی)و ، شـوێنی

داباریینی ڕەحمەتی‌یەتی ، و (ڕاغب)یش فەرمویەتی:-(بلد)شوێنێکی دیاری کراوە بەوە دەوترێ کە خەڵکی تێدا کۆدەبێتەوە و ژیانی تێدا بەسەر دەبەن و لێی دەمێننەوە .

و ((ابغض البلاد إلى الله اسواقها)): ڕق لێبوەترین شوێنەکان بەلای خواوە بازاڕەکانە ، (اسواق)کۆی (سوق)ە ، بۆیەش پێی دەوترێ سوق لەبەرئەوەی کەل و پەلەکان بەرەو ئەوێ دەهێنرێت و تێیدا دەفرۆشرێ ، بۆیەش خوای گەورە لەهەمو شوێنێك زیاتر ڕقی لەو شوێنانەیە ، چونکە شوێنی ناپاکی و فێڵ و بێ ئاگابوون و سوێند خواردنی بە درۆیە لەسەر شتی زۆر کەم و پڕوپوچ و براوە .

(٢٠٥)-(٣٢٧١)- ((خيرُ البقاعِ المَساجدُ ، و شرُّ البِقاعِ الأسْواقُ))
(حسن) (طب ،ك)عن ابن عمر صحيح الترغيب ٣٢٣: حب

**لێکدانەوەی هەندێك لەوشەکان**

البقاع:شوێنەکان

**مانای فەرمودەکە**

(٢٠٥)-(٣٢٧١)-((چاکترینی شوێنەکان مزگەوتەکانن ، وە بەدترین و خراپترینی شوێنەکان بازاڕەکان لەلای خوا))
(حەسەنە)، (طب ،ك)لە ئیبن و لەعومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە ، صحیحی تەرغیب ٣٢٣:حب

## ٤٢- مزگەوتەهەرە پیرۆزەکانی سەر ڕووی زەوی

(٢٠٦)-(١٥٨١)-(٧١٠)-((إنَّ الإسلامَ بدأ غريباً ، وسيعودُ غريباً كما بدأ ، وهو يأرز بين المسجدين كما تأرز الحية في جحرها))
(صحيح) (م)عن ابن عمر مختصر مسلم ٧٢.

**لێکدانەوەی هەندێك لەووشەکان**

بدأ غريباً : دەستی پێ کرد بە نامۆیی و غەریبی (و)

وسيعود غريباً: وە دەگەڕێتەوە بە غەریبی(و)

يأرز:دەگەڕێتەوە ، خڕ دەبێتەوە ، وە هەندێکی کۆدەبێتەوە سەر هەندێکی تێیدا.

المسجدين:مەبەست لە مزگەوتی ، (الحرم)ی مەککەو مزگەوتی (نبوی)ی مەدینەیە .

**مانای فەرمودەکە**

(٢٠٦)-(١٥٨١)-( ٧١٠)- ((بە دڵنیایی‌یەوە ئیسلامەتی بە غەریبی دەستی پێ کردو سەری هەڵدا ، وە لەمەولاش بە غەریبی دەگەڕێتەوە و لە ناوتاندا سەر هەڵدەداتەوە

هەروەکو دەستی پێ کردو سەری هەڵدا وە ئەو دەکشێ و دەگەڕێتەوە ئەو دوو مزگەوتانە هەروەکو چۆن مار لە کونەکەیدا دەکشێ و خڕ دەبێتەوە))

(صەحیحە)(م) لە ئبنو عومەرە و ریوایەتیان کردووە ، موختەصەری موسلیم ٧٢.

**(٢٠٧)-(٢٥٧٩)-(١١٩٥)-((أول مسجد وضع في الأرض المسجد الحرام ثم المسجد الأقصى و بينهما اربعون سنة ثم اينما أدركتك الصلاة ، بعد فصل فإن الفضل فيه))**

(صحيح) (حم ، ق، ن،هـ )عن ابى ذر فقه السيرة:٨٢.

## لێكدانەوەی ووشەكان

وضع:بنیاتنراوە (و).

أدركتك الصلاه: نوێژت پێ گەیەشت ، نوێژ بوو .

الفضل : پیرۆزی .

## مانای فەرمودەکە

(٢٠٧)-(٢٥٧٩)-(١١٩٥)-((یەکەم مزگەوت کە لە زەوی‌دا بنیاتنرا مزگەوتی حەرام بوو لەمەکە پاشان مزگەوتی ئەقصا بوو لە فەلەستین ، وچل ساڵ نێوانیان بوو ، پاشان لەهەر شوێنێك نوێژت پێ گەیشت نوێژ بوو، لە دوای ئەو دوو شوێنە نوێژ بکە بە دڵنیاییەوە پیرۆزی لەو شوێنە دایە ؛کە نوێژی تێدا دەبێ؛))

(صەحیحە) (حم ، ق ، ن ، ە)لەئەبی زەرەوە گێڕاویانەتەوە فیقهی سیرە :٨٢.

**(٢٠٨)-(٣٨٣٩)- ((صلاةٌ في مسجدي هذا أفضل من ألفِ صلاةٍ فيما سواه من المساجد إلا المسجدَ الحَرام))**

(صحيح)(حم ، ق، ت ، ن ، ە)عن أبي هريرة (حم ، م ،ن،ە)عن ابن عمر، (م)عن ميمونة، (حم)عن جبير بن مطعم و عن سعد و عن الأرقم الإرواء :٩٧١، حب١٢٢٧، ١٠٣٥

## مانای فەرمودەکە

((نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا ، چاکترە لە هەزار نوێژ لە چاو مزگەوتەکانی تر جگە لە مزگەوتی حەرام ، ؛کە لەشاری مەککەیە؛))

(صەحیحە) (حم ، ق، ت ، ن ، هـ)لە ئەبوهورەیرەوە (حم ،م ،ن ،هـ) لە ئیبنو عومەرەوە ، (م)لە مەیمونەوە (حم)لە جوبەیری کوڕی موطعیمەوەو لە سەعدو لە ئەرقەمەوە ریوایەتیانکردووە، الإرواء:٩٧١، حب ١٢٢٧، ١٠٣٥.

مونـاوی فەرمویـەتی :- نوێـژ لـە مزگـەوتی حـەرام چاکـترە وەك نوێـژ لـە مزگـەوتی پێغەمبەر (ﷺ) و لـە مەدینـە ، وەکو لـە فەرمودەکەدا هـاتووە کـە ((نوێژێـك لـە مزگـەوتی

پێغەمبەردا (ﷺ) باشترە لە هەزار نوێژ لە چاو مزگەوتەکانی تر ، وە نوێژێك لە مزگەوتی حەرام پاداشتی بە ئەندازەی سەد نوێژە لەبەرامبەر نوێژێ کە لە مزگەوتی مندا بکرێ)).

(٢٠٩)-(٢٨٧٢)-((الصلاة في مسجد قباء كعمرة))(صحيح)(حم ، ت ، ه ، ك )عن أسيد بن حضير

## لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

قباء: شوێنێکە سێ میل لە مەدینەوە دوورە (و).

## مانای فەرمودەکە

(٢٠٩)-(٢٨٧٢)-((نوێژێك لە مزگەوتنی قوباء وەکو عەمرەیەکە))

(صحیحە)(حم ، ن ، ه ، ك)لە ئوسەیدی کوڕی حوضەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە

موناوی فەرمویەتی : (ال)لە (الصلاە)ڕەگەزی (جنسی)ە و نوێژی فەرزو سوننەتیش دەگرێتەوە ، وە ئەگەر (ال)بۆ (عهد)ی بێت ئەوا تایبەت دەکرێت بە فەرزەکانەوە.

زەینەدینی عێراقی فەرمویەتی :-ئەو فەرمودەیە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە سەردانی مزگەوتی (قوباء)ونوێژکردن تێیدا موستەحەببە.

(٢١٠)-(٦٧٦٠)-(٢٣٠٧)-((نزلت هذه الآية في اهل قباء ﴿فيه رجال يحبون أن يتطهروا و الله يحب المطهرين﴾))

(صحيح)(ت)عن أبي هريرة ، الإرواء :٤٥. صحيح ابى داود: ٣٤. (د،ه ، ق، حم)عن ابن خزيمة - عويم بن ساعدة،(ك ،هق)عن ابن عباس

## مانای فەرمودەکە

(٢١٠)-(٦٧٦٠)-(٢٣٠٧)-((ئەم ئایەتە دەربارەی خەڵکی قوبا هاتۆتە خوارەوە ﴿پیاوانێکی تێدان کە پێیان خۆشە پاك ببنەوە ، وە خواش ئەوانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاك دەکەنەوە﴾)).

(صەحیحە)(ت)لەئەبی هورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە ، ئەلئیروا : ٤٥. صەحیحی ابوداود ٣٤، (د،ه ، ق، حم)ئیبنو خوزەیمە - عوەیمی کوڕی ساعیدە ، (ك ،هق)لە ئیبنو عەبباسەوە.

(٢١١)-(٦٧٠١)-((المسجد الذي أُسِّسَ على التقوى هذا))

(صحيح)(م ،ت)عن ابى سعيد ، (حم ،ك)عن ابى ، حب:١٠٣٧سهل.

## لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

التقوى:- ئیبنو سەعدی فەرمویەتی : تەقوا گرتنە دەستی تەواوی ئەو شتانەیە کە دەبنە مایەی پارێزران لە تورەیی خوا و سزاکەی ، بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە و وازهێنان لەو شتانەی بێزاندوونی و قەدەغەی کردوون ، وە تەقوا گەر لەگەڵ وشەی (البر)دا هات ئەو اناوە بۆ خۆپارستن لە تەواوی سەر پێچیەکان .

**ماناى فەرمودەكە**

(٢١١)-(٦٧٠١)-((ئەو مزگەوتەی کە لەسەر بنەمای ؛بناغەی؛ پارێزگاری ؛لە خو اترسان؛ بینیاد نراوە ئەو مزگەوتەی منە))(صەحیحە)(م،ت)لە ئەبی سەعید ، (حم ،ك)لە ثوبەی ، حب ١٠٣٧ لەسەملەوە ڕیوایەتیان كردووە

موناوی سەبارەت بە (المسجد هذا)فەرمویەتی :- مەبەستی مزگەوتی شاری مەدینەیە هەروەكو لەم ئایەتەدا هاتوە﴿لمسجد أسس على التقوى من أول يوم﴾.

## (٢١٢)-(٥٥٨٦)-((ما بَينَ بيتي و مِنبَري رَوضةٌ مِنْ رياضِ الجَنةِ))

(صحيح)(حم ، ق ، ن )عن عبدالله بن زيد المازني (ت)عن علي و ابى هريره.الروض النضير ١١٢٥

**ماناى فەرمودەكە**

(٢١٢)-(٥٥٨٦)-((نێوانی ماڵەكەم مینبەرەكەم باخێكە لە باخەكانی بەهەشت)).

(صەحیحە)(حم ، ق، ن)لە عەبودڵلای كوڕی زەیدی مازنییەوە، (ت)لە عەلی و ئەبی هورەیرەوە ڕیوایەتیان كردووە. الروض النضير ١١٢٥.

<u>موناوی فەرمویەتی</u>:-مەبەست لە (ما بين بيتي)گۆڕكەیەتی كە لەناو ماڵەكەیدایە ، (منبري روضة)وەكو باخێك وایە (من رياض الجنة)لە باخەكانی بەهەشت بۆ داباریني ڕەحمەت بەسەر ئەوكەسەی كە خوا پەرستی لێ دەكا ، وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە ،كە (مینبەركەی لەسەر حەوزەكەیەتی)هەروەكو ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی كردووە.

## (٢١٣)-(٧٣٣٢)-((لا تَشد الرِّحال إلاّ إلى ثَلاثةِ مساجِدَ المسجِدِ الحرام ، ومسجدي هذا و المسجِدَ الأقصىٰ))

(صحيح)(حم ، ق، د، ن،ه)ن ابى هريره (حم ،ق،ت،ه)عن أبي سعيد ، (ه)عن ابن عمرو أحكام الجنائز (ص:٢٢٤-٢٢٥) الروض :٧١٣، الإرواء:٧٧٣ ، ٧٩٠ مختصر مسلم ٧٨٩ .

**لێكدانەوەی هەندێك لەوشەكان**

لا تشد : ناپێچرێتەوە

المسجد الأقصى:مەبەست لە بیتو لمەقدیسە.

## ماناى فەرمودەكە

(٢١٣)-(٧٢٣٢)-((بارگەو بنە ناپێچرێتەوە (مەپێچنەوە) بەمەبەستی بە پیرۆز زانین؛ تەنها بۆ سێ مزگەوتان نەبێ ، مزگەوتی حەرام ؛كەلە مەككەی پیرۆزە؛ وە مزگەوتی من ؛كە هی پێغەمبەری خودایەو لە شاری مەدینەیە؛ وە مزگەوتی ئەقصا ؛كە لە فەلەستینە؛))

(صەحیحە)(حم ، ق، ، م ،ن ، ه)لەئەبی هورەیرەوە ، (حم ، ق، ت ،ه) لە ئەبی سەعید ، (ه)لە ئیبنوعومەرەوە ، ئەحكامی جەنائیز ل:٢٢٤-٢٢٥ ، ئەلروەز :٧١٣، ئیرواء :٧٧٣-٧٩٠. موختەصەری موسلیم ٧٨٩.

موناوی فەرمویەتی :- سەفەر ناكرێ تەنها بۆ ئەو سێ مزگەوتە نەبێ جا ئەو سەفەرە بە پێ بێ یاخود بە وولاخ یان هەرشتێكی تر یچ جیاوازیەكی نیە ، بۆ نوێژ تێدا كردن تەنها بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ ، چونكە سەفەر ناكرێ لە بنەڕەتدا تەنها بۆ نوێژ كردن نەبێ ، وە نەهیەكەش بۆ (تنزیهی)یە لەلای شافعیەكان ئەوەش بۆچونی جمهوری زانایانە ، بەلام بەبۆچوونی ر تەی (عیاض)و (الجونی)و قاضي حسین) ئەو نەهیەیە بۆ (التحریم)ە ، وە حەرامە سە ركردن بۆ سەر گۆڕی پیاو چاكان و وە ئەوشوێنانەی كە چاكن بۆ موتفەڕەك .

وە لێرەدا مەبەست لە خودی مزگەوتی حەرامە نەك كەعبە و وە نە مەككەش ئەگەرچی بە هەمووی دەوترێ (بلد الحرام)، وە (مسجدی هذا)لە ریوایەتێكی تردا هاتوە (مسجد الرسول)ە (ﷺ) وە (المسجد الأقصی)مەبەست لە بیتو لمەقدیسە وە بۆیە پێی دەوترێ (اقصی)چونكە بەماوەو بە كات لە مزگەوتی مەككەوە دوورە ، یان هیچ مزگەوتێك لە دوای ئەوەوە نیە ، یان لەبەرئەوەی بەرزترینی شوێنە و نزیكترین شوێنە لە ئاسمان ، وە بۆیە ئەوسێ مزگەوتەی تایبەت كردووە چونكە : یەكەم شوێنی حەج و قیبلەی موسڵمانانە وە دووەمیان لەسەر پارێزگاری(تقوی)بنیات نراوە ، وە سێ یەم قیبلەی ئوومەتانی پێشوو بووە و وەبۆیەش پیرۆزن چوونكە پێغەمبەران بنیاتیان ناون .

## ٤٣- پاداشتی دروست كردنی مزگەوت و چۆنیەتیان

(٢١٤)-(٦١٢٧)-((من بنیٰ للهِ مسجِداً ، بنیٰ الله له بیتاً في الجَنة))

(صحیح) (ه)عن علي الروض النضیر٨٨٣، ٩٥٤.

### ماناى فەرمودەكە

(٢١٤)-(٦١٢٧)-((هەر كەسێك بۆ خوا مزگەوتێك دروست بكات ، ئەوا لە پاداشتی ئەمە ، خوا لە بەهەشتا ماڵێكی بۆ دروست كردووە))

(صەحیحە)(ھ)لە عەلیەوە ریوایەت کراوە .٨٨٣، ٩٥٤ .

موناوی فەرمویەتی : ھەرکەسێ خۆی دروستی بکات یان فەرمان بکات بە دروست کردنی .

(٢١٥)-(٦١٣١)-((مَنْ بنىٰ مسجِداً يبتغي بهِ وجْهَ الله بَنىٰ الله مِثْلهُ في الجَّنة))

(صحيح) (حم ، ق ، ت،ھ)عن عثمان صحيح الترغيب ٢٦٤ مختصر مسلم ٢٤٠.

## لێکدانەی ھەندێك لەوشەکان

يبتغي به : مەبەستی پێ ی (و).

وجه الله:ڕووی خوا ، دیارە مەبەست پێ ی لە ڕووی خو ا، واتە تەنھا بۆ ئەوبێ ، وەلەو فەرمودەیەدا بوونی سیفەتی ڕوو بۆ خوا دەچەسپێنێ .(و)

## مانای فەرمودەکە

(٢١٥)-(٦١٣١)-((ھەرکەسێك مزگەوتێك دروست بکا و مەبەستی پێ ی ڕووی خوا بێت ، خوای گەورە ھاوشێوەی ؛بەوێنەی؛ ئەو ماڵێکیبۆ دروست دەکا لە بەھەشتدا)). (صەحیحە)(حم ، ق، ت،ھ)لە عوسمانەوە ڕیوایەتیان کردووە (صەحیحی ترغیب ٢٦٤). موختەصەری موسلیم ٢٤٠.

موناوی فەرمویەتی :- ھەمو مزگەوتێك دەگرێتەوە ، گەورە بێت یاخود بچوك ، وە لە ڕیوایەتی ئیبنو ماجەدا ھاتووە کە (يذكر فيه اسم الله)یادی خوای تێدا بکرێ و (يبتغي به وجه الله)داوای ڕەزامەندی خوای پی بکات ، ئەمە لە مانای فەرمودەیەکدا کە طەبەرانی گێڕاویەتەوە مەبەستی پێ ی ڕووبازی و خۆ دەرەخستن نەبێ ، مەبەست لەوەیە کە نیازی پاك و بێ و بە تەنھا بۆ خوا بێ ،' پێشەواکان بە توندی قسەیان لەسەر حەرامێتی ئەم کارە کردووە ، ھەتا ئیبنولجەوزی فەرمویەتی : ھەرکەسێك ناوی خۆی لەسەر مزگەوتەکە بنووسێ ئەوە بە دوورە لە ئیخلاص و نیاز پاکی .

(٢١٦)-(٥٨٥)-((إذا زخرَفْتُمْ مساجِدَكُم و حُليتُم مصاحِفَكُم فالدَّمارُ عليْكُم))

(حسن) (الحكيم)عن ابي درداء الصحيحة ١٣٥١.

## لێکدانەوەی ھەندێك لەوشەکان

زخرفتم : ڕازانتاننەوە ، جوانتان کرد ، نەخشتان تێدا کرد.

حليتم: جوانتان کرد ، بە زێر یان بە زیو .

الدمار : ھەلاك و لە ناو وچوون و نارەحەتی .

## مانای فەرمودەکە

(٢١٦)-(٥٨٥)-((ئەگەر مزگەوتەکانتان نەخشاندن و قورئانەکانتان ڕازاندەوە ، بەزێر و بەزیو دەبڕوخێ ؛بتەپێ بەسەرتاندا)).

(حەسەنە) (الحکیم) لە ئەبی دەرداوە ، ریوایەتیان کردووە صەحیحە ١٣٥١،

مونـاوی فەرمویـەتی : ئەگـەر مزگەوتـەکانتان جوانکـردن بـە نەخشـاندنیان ، (و حلیتـم)ڕازاندتانـەوە (مصـاحفکم)قورئانـەکانتان بـە زێـڕو زیـو (فالدمـار) ، زەمەخشـەری فەرمویەتی :هەلاکەت و لە ناو چوون بەهۆی ئەمەوە (علیکم)دێتە سەرتان و توشی دەبن ، ئەمەش (علیکم) یان دوعایە ، یاخود هەواڵە ؛واتە دێتـە سـەرتان بە کردنـی ئـەم کارانە؛ ، ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان و زێڕاوکردنی پەڕاوەکان نەهی لێ کراوە ، چونکە دەبنە مایـەی سـەرقاڵی و لـە دەست دانـی خشوع و بیرکردنـەوەو ئامـادەیی تـەواو لەبەرامبـەر خـوادا ، شافعیەکان ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان ئەگەر کەعبەش بێ بە زێڕو زیو بە حەرام دەزانن وە بە غەیری ئەوانیش (زێڕو زیو)دەیبێزێنن و بە مەکروهی دەزانن.

(٢١٧)-(٥٥٥٠)-((ما أمرت بتشيد المَساجد))

(صحيح)(د)عن ابن عباس صحيح ابى داود ٤٧٤ ، المشكاه ٧١٨ ،

## لێکدانەوەی هەندێك لەوشەکان

تشید : بەرزکردنەوە (و).

## مانای فەرمودەکە

(٢١٧)-(٥٥٥٠)-((فەرمانم پێ نەکراوە بە بەرزکردنەوەی مزگەوتەکان))

(صەحیحە)(د)لە یبنوعەبباسەوە ریوایەتیان کردووە صەحیحی ئەبی داود . ٤٧٤، میشکات ٧١٨.

مونـاوی فەرمویـەتی :-(ما أمرت بتنشيد المساجد)مانـای فـەرمانی پـی نـەکراوە بـە بەرزکردنـەوەی بیناکەی بۆئەوەی سەرنەکێشێ بۆ ڕازاندنـەوە و جوان کردنیـان ،چونکـە کاری ئەهلی کیتابـە و جۆرێکیشـە لەسـەر زەنشت ،بە غەوی‌فەرمویـەتی : (التشيد)بەرزکردنـەوەی بینـاو بڵند کردنیـەتی وە کـاتێك جوەکان و گاورەکـان دەسـتکاری کیتابەکانیان کـرد ئـەو کاتە کەوتنە ڕازاندنەوە و جوانکردنی پەرستگەکانیان.

ئیمـامی عومـەر (ﷺ) لەگـەڵ ئـەو هـەموو سـەرکەوتنانەی کـە بـە دەسـتی هێنـا لەسـەر دەمی خەلافەتی خۆی هاوکاتیش مـاڵی زۆری لەبەردەست دابوو ئـەو مزگەوتـەی نـەگۆڕی کە تێیدا بوون ، وە یەکەم کە سێك کە دەستی کرد بە ڕازاندنـەوەی مزگەوتـەکان (وەلیـدی کوڕی عبدالملك)بوو ، زۆرێك لەسەلەف بێدەنگ بوون لە ترسـی بـەرپابوونی فیتنـە ، بـەڵام ئەبو حەنیفە (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێت)ڕێی داوە بە ڕازاندنـەوەی (مزگەوت) ، کاتێك کـە

مەبەست تێی‌دا بە گەورە زانینی مزگەوت بێ و پارەو ماڵی لە (بیت المال) بۆ سەرف نەکرێ.

(٢١٨)-(٥٨٩٥)-((مِنْ اشراطِ السَّاعة أنْ يتباهىٰ الناسُ في المَساجِد))

(صحيح) (ن)عن أنس صحيح ابى داود ٢٧٥ . (حم،د،الدارمى)ابن غزيمه ، (هـ،ع،هق).

## لێکدانەوەی هەندێك لەووشەکان

يتباهى: شانازی دەکەن

## مانای فەرمودەکە

(٢١٨)-(٥٨٩٥)-((لە نیشانەکانی هاتنی رۆژی دوایی ئەوەیە کە خەڵکی شانازی دەکەن بە بنیات نانی مزگەوتەکانەوە دەکەن))

(صەحیحە)(ن)لەئەنەسەوە ریوایەتی کردوەو، صەحیحی ئەبی داود ٢٧٥. (حم د،الدارمی)ئیبن وخوزیمە(هـ،ع،هق).

موناوی فەرمویەتی :- نیشانەکانی هاتنی رۆژی دوایی (الآخرة)(قیامەت)زۆرن ئەمە یەکێکە کە موسڵمانان شانازی پێوە دەکەن بە ڕازاندنەوە و جوانکردنیان ، وەکو ئەهلی کیتاب کە دوای گۆڕینی دینەکەیان کردیان، ئێوەش وەکو ئەوان دەکەن جا ئەگەر ئێوەش واتانکرد ئەوا رۆژی دوایی دێت .

صەنعانی فەرمویەتی :- (يتباهى)یەتی ئەوەیە کە بڵێ مزگەوتی من چاکترە لە مزگەوتی تۆ بەرزترە ،. وە ئەم فەرمودەیە نیشانەیەکە پێغەمبەرایەتی وە دەبێ مزگەوت بە خواپەرستی جوانبکرێ .

# ٤٤- ئادابەکانی مزگەوت

(٢١٩)-(٢٩٦)-(١٢٥)- ((إذا أذَّنَ المؤذنُ فلا يَخْرجَ أحَدٌ حتَّىٰ يُصلِّي))

(صحيح) (هب)عن ابي هريرة (الترغيب ٢٥٨-٢٦٠الطيالیسی حم

## مانای فەرمودەکە

(٢١٩)-(٢٩٦)-(١٢٥)- ((ئەگەر بانگ بێژ بانگی فەرموو با کەس دەرنەچێ تا نوێژ دەکات)).

(صحیحە)(هـ) لە ئەبی هورەیرەوە ریوایەتی کردووە تەرغیب ٢٥٨-٢٦٠ طیالیسی حم

(٢٢٠)-(٥١٥)((إذا دخلَ أحدكُمُ المسجِدَ فليسلِّمْ علىٰ النَّبي و ليَقُلْ اللّهمَ افتحْ لِي أبوابَ رحمتِكَ ، وإذا خرج فليَسَلِّمْ علىٰ النَّبي و ليقلْ اللّهم أسئلكَ مِن فضلِك))

(صحيح)(د)عن ابي حميد او ابي اسيد(هـ)عن ابي حميد صحيح ابي داود ٤٨٤ : الدارمي ، ابو عوانة ، هق

## مانای فەرمودەکە

(٢٢٠)-(٥١٥)((ئەگەر هەر یەکێکتان چووە مزگەوتەوە با سەڵاوات لە پێغەمبەربدات بڵێ (اللهم افتح لي ابواب رحمتك)[1] وە کاتێك کە دەرچوو با سەڵاوات لە پێغەمبەربداو بڵێ : اللهم إني أسئلك من فضلك[2]))

(صەحیحە) (د)لە ئەبی حومەیرەوە یان ئەبی ئوسەید ، (ه) لە ئەبی حومەیدەوە یان ئەبی ئوسەید ریواتیان کردووە ، صەحیی ئەبی داود ٤٨٤ : دارمی ئەبوعەوانە هق .

<u>مەناوی فەرمویەتی</u> : سەڵاوات دان سوننەتێکی موئەکەدەیە یان واجبە ، لە بەرئەوەی مزگەوتەکان شوێنی یادی خو اکردنن و سەڵاوات دانیش لە پێغەمبەر بەشێکە لەویادە وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە (اغلق عني ابواب معصيتك و غضبك و اصرف عني الشيطان و وسوته)واتە: دەرگاکانی رق و تورەیی خۆتم لەسەر داخەو شەیتان و وەسوەسەکەیم لێ لابدە ، وەنهێنی پەیوەست کردنی یادی رەحمەت و داواکردنی کاتی چونوە ژورەوە و داوای بە خشش و چاکە لەکاتی هاتنە دەرەوەدایە ئەو کەسەی کە دەچێتە ژورەوە سەرقاڵی پەرستن و داواکردنی بەهەشتە ئەوەش لەگەڵ رەحمەتەکەی دەگونجێ ، وە کاتێك کە دێتە دەرەوە داوای بژێوی دەکات ئەمەش لەگەڵ فەزڵەکەیدا گونجاوە .

(٢٢١)-(٥١٣)-((إذا دخَلَ احدكُم المسجدَ فلا يجلسَنَّ حتّىٰ يُصلِّي ركعتين)).

(صحيح) (حم،ق،ع)عن ابی قتادە ، (ه)عن ابی هريرە ، الروض١٠٠٨ ، الإرواء ٤٦٧ ، رياض الصالحين ١١٥١.

## مانای فەرمودەکە

(٢٢١)-(٥١٣)-((ئەگەر هەر یەکێکتان چووە مزگەوتەوە با دانەنیشێ تا دوورکات نوێژ دەکات))

(صەحیحە)(حم ، ق ، ع)لە ئەبی قتادەوە ، (ه)لە ئەبی هورەیرەوە ریواەیتیان کردووە ، رەوز ١٠٠٨ ، ئیروا٤٦٧ ، ریازو الصالیحن١١٥١ .

<u>صەنعانی فەرمویەتی</u> : روی دیاری ئەو فەرمودەیە واجبێتی نوێژی (تحيه المسجد) دەگەیەنێ ، ئەگەر چی جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە مەندوبە[3]

---

(١) واتە : پەروەدگار دەرگاکانی بەزەیی خۆتم لێ بکەرەوە .

(٢) واتە:- پەروەردگار داوای بەخششو چاکەت لێ دەکەم .

(٣) مەندوب: بەوە دەوترێ ئەگەر بیکەی خێرەو ئەگەر ئەنجامیشی نەدەی تاوانبار نابی .

وە موناوی فەرمویەتی : روی دیاری ئەم فەرمودەیە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە نوێژەکە بەر لە هەموشتێکە بەر لەسەلام کردنە لە موسڵمانانی ناو مزگەوت ، هەروەکو لە فەرمودەی تریشدا بە ڕاشکاوی هاتوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پشتدا (لە پێشا)نوێژی مزگەوتی کردووە ئەوجار سەلامی لە خەڵکەکە کردووە .

ئیبن قەیم فەرمویەتی : سەلام کردن لە بەدیهێنەر (کە خوای گەورەیە) لە پێش سەلام کردنە لە بەدیهێنراوەکانی .

(٢٢٢)-(٤٤٢)((إذا توضأ احدكم فأحسن وضوءه ، ثم خرج عامدا إلى المسجد ، فلا يشبكن بين يديه ، فإنه في صلاة))

(صحيح)(حم ، ت ،ن) عن كعب بن عجرة ،المشكاة ٩٩٤ ، صحيح السنن ٥٧١، الإرواء ٣٧٩.

## لێکدانەوەی هەندێك لەوشەکان

عامدا : بەنیازی بە مەبەستی (و). فلا يشبكن بين يديه :پەنجەکانی هەردوودەستی نەخاتە ناو یەکتریەوە و لەدەوری چواردەوری قەچەکانی بیانکاتە گرێ(و).

## مانای فەرمودەکە

(٢٢٢)-(٤٤٢)((ئەگەر هەر یەکێکتان دەست نوێژی گرت ، بە جوانترین دەست نوێژ ، پاشان دەرچوو بەنیازی چونە مزگەوت با پەنجەکانی دەستی نەخاتە ناو یەك و بەدەوری قاچەکانیدا ؛گەروانەکا ؛ئەوا لە نوێژدایە؛ تا لە مزگەوتا بێ؛))

(صەحیح) (حم ، ت ،ن) لە کەعبی کوڕی مالیك و عەجزەوە ریوایەتیان کرووە میشکات ٩٩٤. صەحیحی سونەن ٥١٧ ، ئیروا ٣٧٩.

موناوی فەرمویەتی :(إذا توضأ احدكم فأحسن وضوءه) مانای ئەوەیە ، کە دەست نوێژێکی تێرو تەواو لە هەموو ڕویەکەوە بگرێ پاشان لەشوێنی خۆی دەرچێ بەمەبەستی چوونە مزگەوت بۆ نوێژ بەکۆمەڵ (جماعه) دەوترێ (عمد للشئ) واتە نیازی کرد بۆی ، (فلا يشبكن بين أصابع يديه)پەنجەکانی دەتسی نەخاتە ناریەك چونکە شەیتان وا دەکا و خۆچواندنە بەو ، دیارە ئەمە مەندوبە (موستەحەببە)و (فإنه في الصلاه)ئەوە حوکمەکەی وەکو حوکمی ئەو کەسە وایە کە لە نوێژدایە ، وە دەڵێ (خرج من بيته)واتە: لە ڕێگایش خۆی بپارێزێ لە کاری بەدوو ناشەرعی .

(٢٢٣)-(٧٩٦)-((إذا مَرَّ احدُكُم في مَسجدنا او في سوقِنا و مَعَهُ نبلٌ فليُمسِك علىٰ نِصالها بكفِه لا يَعْقر مسلماً))

(صحيح) (ق،د،هـ)عن ابى موسى مختصر مسلم ١٨١٧.

## لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

نبل : ڕمب ، نێزە ، تیر .

نصالها :لای تیژی نێزە .

لا یعقر : بۆ ئەوەی بریندار ی نەکات

## مانای فەرمودەکە

(٢٢٣)-(٧٩٦)-((ئەگەر یەکێکتان ڕۆی ؛تێپەری بەناو؛مزگەوتماندا یاخود بازاڕماندا وە نێزەی(ڕمبی) پێ بوو با بەلەپی دەستی لا تیژەکەی بگرێ بۆ ئەوەی موسڵمانێك بریندار نەکات))

(صەحیحە)(ق،د،ه)لە ئەبی موسا ریوایەتیان کردووە موختەصەری موسلیم ١٨١٧.

مونـاوی فەرمویـەتی : هـۆ موسـڵمانان مەبەسـت لـە تێکـڕای مزگەوتـەکانی ئوممـەتی ئیسلامیە نەك تەنیا مزگەوتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) وەکە دەفەرموێ (مسلما)ئەهلی ذیمە (ذمة)گیانلەبەرانی ڕێزدریش دەگرێتـەوە ، وە بۆیـە موسـڵمانی تایبـەت کـردووە لەبەر گرنگـی دان بـە پلـەو پایـەی دوسـڵمانان ، وە ئـەم فەرمودەیـە حـەرامێتی کوشـتنی موسڵمانانی لێ دەفامرێتـەوە ، هـەروەها ئـەوە دەگەیـەنێ کـە بردنـە ژوورەوەی چـەك بـۆ مزگەوتەکان شتێکی ڕێ پێدراوە بەو مەرجەی باسمان کرد .

(٢٢٤)-(٢٨٨٦)-((البِصاقُ فِي المَسجِدِ خَطِيئَةٌ و كفارتُها دفْنُها))

(صحيح) (ق،٣) عن انس الروض النضير ٤٨. صحيح ابي داود ٤٩٤. مختصر مسلم

## لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

البصاق : تف .

کفارتها : تۆڵەکەی ؛ڕەش کردنەوەی .

## مانای فەرمودەکە

(٢٢٤)-(٢٨٨٦)-((تف ؛فڕێ دان؛ لە مزگەوتدا تاوانە و ، تۆڵەکەی شاردنەوەیەتی))

(صەحیحە) (ق،٣)لە ئەنەسەوە ریوایەتیان کردووە ، ڕەوز النزیر ٤٨. ، صەحیحی ئەبی داود ٤٩٤. موختەصەری موسلیم ٢٥٠.

مونـاوی فەرمویـەتی : فڕێدانـی تـف لـە زەوی‌دا بـێ ؛زەوی مزگـەوت؛ یـاخود بـە دیوارەکـانی‌دا بکرێـت یـان هەربەشـێکی ئەگـەر چـی ئـەو کەسـەی تفەکـە ڕۆدەکـات لـە دەرەوەش؛ لە دەرەوەی مزگەوتدا بێ؛ جا ئەگەر ئەم تاوانەی کرد ، ئـەوا کەفارەتەکـەی داپۆشینی خودی تفەکەیە بەخۆڵ یان لابردنی و پاککردنەوەیەتی .

(٢٢٥)-(٥٤٥٦)-((لِيُصَلِّ الرَّجُلُ فِي المَسْجِدِ الذي يَلِيهِ و لا يَتَتَبَّعُ المساجِدَ))

(صحيح) (طب)عن ابن عمر الصحيحه ٢٢٠٠ ، تمام ، عق

## مانای فەرمودەکە

(٢٢٥)-(٥٤٥٦)-((با پیاو نوێژ بکات لەو مزگەوتەی کە لەماڵەکەیەوە لێیەوە نزیکە ، وە با بە مزگەوتاندا نەگەڕێ))

(صەحیحە)(طب)لە ئبنوعومەرەوە ریوایەتی کردووە صەحیحە ٢٢٠٠ تمام ، عق .

موناوی فەرمویەتی : (لیصل الرجل فی المسجد الذي یلیه)ئەوەی کە نزیکە لە ماڵەکەیەوە ، (ولا یتتبع المسجد)جارێك نوێژ لەوێ نەکاو جارێك لەوێ بیکات و هەرجارەی بیگوازێتەوە بۆ مزگەوتێکی تر ، لەبەرئەوەی پێچەوانەوەی شتێکە کە چاکترە .

(٢٢٦)-(٥٨٩٦)-((مِنْ أشراط السَّاعةِ أن يَمُرَّ الرَّجُلُ فِي المَسْجِدِ لا يُصَلِّي فيهِ رَكْعَتيْنِ ، وإنْ لا يُسَلِّمَ الرَّجُلُ إلا علىٰ مَنْ يَعرِفُ))

(صحيح) (طب)عن ابن مسعود ، الضعيفة ٤٥١٤، تعليق على ابن خزيمه ١٣٢٦

## مانای فەرمودەکە

(٢٢٦)-(٥٨٩٦)-((لە نیشانەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە کە پیاو بەلای مزگەوتدا تێ دەپەڕێ و دووڕکات نوێژی تێدا ناکات ، وە لە نیشانەکانی ئەوەیە وە پیاو سڵاوناکات لە کەسێك مەگەر بیناسێ))(صەحیحە)(طب)لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەتیان کردووە ضەعیفە ٤٥١٤ تەعلیقەکەم لە سەر ئیبنو خوزەیمە ١٣٢٦ .

(٢٢٧)-(٦٠٨٤)-((مَنْ اكلَ ثوماً او بَصَلاً فَلْيعتَزِلْنا وليَعْتَزِلْ مَسْجِدَنا ، وليَقْعُدْ فِي بَيتِه))

(صحيح) (ق) عن جابر مختصر مسلم ٢٥٢ ، الروض ٢٣٨، الارواء ٥٤٧

## مانای فەرمودە

(٢٢٧)-(٦٠٨٤)-((هەر کەسێك سیر یاخود پیوازی خوارد با لێمان دابڕێ -دوور کەوێتەوە -،وەبا لەمزگەوتمان دوورکەوێتەوە ،وەبا دابنیشێ لەماڵەکەی خۆیدا))
(صەحیحە) (ق) لە جابرەوە ریوایەتی کردوە موختەصەری موسلیم ٢٥٢ ، ئیروا ٥٤٧.

(٢٢٨)-(٦٨٨٥)-((نَهىٰ عَنْ الشِّراءِ و البَيْعِ في المَسجد ، و ان يُنْشَد فيهِ ضَالّة ، وأن يَنْشُد فيه شِعْر ، ونهىٰ عَن التحلّقِ قَبْلَ الصَّلاة يَوْمَ الجُمُعَة))

(حسن)(حم ،ع)عن ابن عمر صحيح ابی داود ٩٩١.

## لێكدانەوەی هەندێك لەووشەكان

ينشد فيه : هاواری بكرێ تێيدا ، بانگ رابهێشترێ تێيدا(و).

ضالة : ون بوو ، گيانلەبەربێ يان هەر شتێكی تر (و).

التحلق : كۆی (حلقه)يە ، بەستنی چەند كۆمەڵێك و دوور لە يەكتری (و) .

## مانای فەرمودەكە

(٢٢٨)-(٦٨٨٥)-((قەدەغەی كردووە ؛پێغەمبەری خوا(ﷺ)، كە كڕين و فرۆشتن لە مزگەوتدا بكرێ ، وە كە بانگی تێدا رابهێنتشرێ؛بۆ دۆزينەوەی شتی؛ وون بوو، وە قەدەغەی كردووە لە بەستنی ئاڵقان پێش نوێژ لە رۆژی هەينیدا))(حەسەنە)(حم ،ع)لە ئيبنوعومەرەوە ريوايەتيان كردووە صەحيحی ئەبی داود ٩٩١.

موناوی فەرمويەتی :بە مانا پەيمانی كڕين و فرۆشتن تێيدا ببەسترێ كارێكی ناپەسەندە چونكە مزگەوتەكان بۆ ئەوە دروست نەكراون هەروەكو لە فەرمودەيەكی ئيمامی موسليمدا هاتووە ، سەبارەت بە هۆنراوەش گەر پەسەندو باش بێ و باس لە شتی پاك و رەوشتی بەرز بكات ئەوا رێ پێدراوە ، پياوێك بە مزگەوتدا تێپەڕی كڕين و فرۆشتنی دەكرد عەتا ؛يەكێكە لە پێشەوا تابيعيەكان؛ پێ گوت ، بڕۆ بۆ بازاڕی دونيا ئێرە بازاڕی قيامەتە . (ونهی عن التحلق قبل الصلاه يوم الجمعه)ئەمە لەبەر پچڕاندنی ريزەكانە چوونكە، فەرمان كراوە بەوەی كە لە رۆژی جومعەدا پەلە بكەن لە هاتن بۆ مزگەوت و ريزەكان راستكەن ، وەئەو كەسەی لە پێشتر بێ ئەو خێری زياتر دەست دەكەوێ .

(٢٢٩)-(٧٢١٥)-((لا تتَّخذوا المَساجِدَ طُرُقاً إلا لِذِكْرٍ أو صَلاةٍ))

(حسن) طب)عن ابن عمر الصحيحه ١٠٠١.

## مانای فەرمودەكە

(٢٢٩)-(٧٢١٥)-((مزگەوتەكان مەكەن بە رێچكە ؛بۆهاتو چۆتان مەگەر بۆ يادی خوا بچن يان بۆ نوێژ))(حەسەنە)(طب) لە ئيبنوعومەرەوە ريوايەتیكردووە صەحيحە ١٠٠١.

## ٤٥- ئادابەکانی چوونی ئافرەت بۆ مزگەوت و ئەو بابەتانە .

(٢٣٠)-(٢٢)-((ائْذِنوا للنِّساءِ باللَّيلِ إلىٰ المساجِدِ))

(صحيح) (حم ، م،ت،د) عن ابن عمر صحيح السنن ٥٧٧ . خ.

### مانای فەرمودەکە

(٢٣٠)-(٢٢)-((ڕێ بدەن بە ئافرەتان کە بەشەو بچن بۆ مزگەوتان)) (صەحیحە)(حم ،م،د،ت) لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتیان کردووە . صەحیحی سونەن ٥٧٧. خ.

موناوی فەرمویەتی : (الإذن) لەشەرعدا کردنەوەی دەرگایە لەسەر شتێك کە لە شەرعدا قەدەغە کراوە ، (للنساء) ئەو ئافرەتانەی کە ناترسن لێیان کە تووشی فیتنە ببن، وەکە دەڵێ ، (بالليل)گشتی‌یەو ڕۆژیش دەگرێتەوە بە ئەولاتر ، بەڵام هەندێك لە حەنەفی مەزهەبەکان ووتویانە بە تەنها شەو ، چونکە بەشەو فاسقەکان خەریکی خەون و بەڕۆژ بڵاو دەبنەوە ، ئیبنو حەجەریش ڕەددی داوەتەوە بەوەی کە لەشەودا زیاتر گومانیان لێ دەکرێ ، چونکە بەڕۆژ بەرگریان لێ دەکرێ و دەترسن لەوەی کە خەڵك بیانبینێ ،بێ گومان ئەوە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لەگەڵ بوونی بەرەکەت و پیرۆزیەکەیدا کە فەسادیش نەبووە ، هەروەکو لە ریوایەتێکی عائشەدا (خوای لێ ڕازی بێت) هاتوە کە وتویەتی : ((لو ادرك النبي ما أحدث النساء بعده لمنعهن الخروج إلى المسجد كما منعت نساء بني إسرائيل))واتە:-((ئەگەر پێغەمبەر دەیزانی و دەرکی کردبا بەوەی ئافرەتان چیان داهێناوە دوای ئەو ئەوا قەدەغەی دەکردن لەوەی کە بچنەمزگەوت هەروەکو چۆن ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل قەدغە کران))، بەڵام ئێستا دەرچوونی ئافرەت پەیوەستە بە پارێزەرانی لە فیتنە و فەساد ، وە ئەگەر پیرەژنێك بێت قەدەغەی لەسەر نیە ، وە ئەو فەرمودەیە ئەوەی لێدەفامرێتەوە کە ئافرەت نابێ بەبێ ڕێپێدرانی (الإذن)لە ماڵەکەی دەربچێ .

(٢٣١)-(٥٠١)-(٢٢٨)-((إذا خَرَجتْ إحداكُنَّ إلىٰ المَسْجِدِ فلا تَقْرَبنَّ طِيباً))

(صحيح) (حم)، عن زينب الثقفية الصحيحة ١٠٩٤ .

### مانای فەرمودەکە

(٢٣١)-(٥٠١)-(٢٢٨)-((ئەگەر هەر یەکێکتان دەرچوو :لە ئافرەتان ، لە ماڵەکەی بەرەو؛ بۆ مزگەووت با نزیکی بۆن نەکەوێ)) (صەحیحە)(حم) لە زەینەبی ثەقەفیەوە ریوایەتی کردووە صەحیحە . ١٠٩٤ .

(٢٣٢)-(٢٧١٠)-((ايُّما اِمراةٍ وَ ضَعَتْ ثِيابَها في غيرِ بَيْتِ زَوجِها فقد هَتَكَتْ سِتْرَ ما بَينَها و بينَ اللهِ عز وَجلَّ)) .

(صحيح)(حم ،هـ،ك)عن عائشه صحيح الترغيب ١٦٥.

## لێکدانەوەی هەندێک لەوشەکان

هتکت:دڕاندویەتی ؛ئەتکی کردوەو؛ سوکایەتی پێ کردووە

## مانای فەرمودەکە

(٢٣٢)-(٢٧١٠)-((هەر کاتێك کە ئافرەتێك پۆشاکەکەی جگە لەماڵی مێردەکەی دلکەند ئەوا بەدڵنیاییەوە سوکایەتی بە پەردەی نێوان خۆی و خوای گەورەی کردووە)). (صەحیحە) (حم ،ھ،ك)لەعائشەوە ڕیوایەتیان کردوە صەحیحی تەغریب ١٩٥

موناوی فەرمویەتی :هەرکاتێك خۆیدانەپۆشیوپۆشاکەکانی دانا لە بەرامبەر خەڵکی بێگانەدا ئەوا سوکایەتی دەکا بە پەردەی نێوان خۆی و خوای گەورە ، چونکە خوای گەورە پۆشاکی ناردووە بۆ ئەوەی کە عەورەتیان داپۆشێ ئەو پۆشاکەش پۆشاکی تەقوایە ، جا ئەگەر لە خوا نەترساو خۆی دانەپۆشی ، خوای پەروەدگاریش تورە دەبێ و سوکایەتی پێ دەکا ، هەروەکو چۆن ؛ئەو ئافرەتە ؛ سوکایەتی بەمێردەکەی کردووە.

(٢٣٣)-(٣٣١١)((خير الصلاة النساء في قَعْرِ بُيوتهنَّ))

(صحيح) (طب) عن أم سلمه الصحيحه ١٣٩٦ م ،بن خزيمه .ك،القضاعي .

## لێکدانەوەی هەندێک لە وشەکان

قعر: ناوجەرگەی ماڵەکەی ، ناوەڕاستی ئەوەی کە دیواری بەدەورەوەیە .

## مانای فەرمودەکە

(٢٣٣)-(٣٣١١)((باشترین نوێژی ئافرەتان لە ناو ژووری ماڵەکانیانە))

(صەحیحە)(طب)لە ئومسەلەمەوە ڕیوایەتی کردووە ، صەحیحە ١٣٩٦ :حم ئیبنو خوزەیمە ،ك قوضاعي .

موناوی فەرمویەتی : هەتاکو نوێژە فەرزەکانیش ؛هەردەبێ لە ماڵەوە بینکات؛ بەهەقیش وتویەتی : ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نابێ ؛ئافرەتان؛ قەدغە بکرێن لە چوونیان بۆ مزگەوت وە لە ڕیوایەتی تردا هاتوە کە ماڵەکەیان بۆ نوێژ باشترە لە مزگەوت ، چونکە ؛ئافرەتان؛گەورەترین پەتن بەدەست شەیتانەوە بۆ لە خشتە بردنی پیاوان.

(٢٣٤)-(٤٣٦٧)-(١٥١٩)-((قد اذن الله لكن أن تخرجن لحوائجكن))

(صحيح) (ق) عن عائشه

## لێکدانەوەی هەندێک لەوشەکان

لحوائجكن : بۆ پێویستیەکانیان (و)

## مانای فەرمودەکە

(٢٣٤)-(٤٣٦٧)-(١٥١٩)-((بە دڵنیاییەوە خودا ڕێی داوە پێتان ؛ئەی ئافرەتان؛ کە بۆ پێویستیەکانتان ؛لە ماڵ؛ دەربچن)) صەحیحە (ق)لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە.

(٢٣٥)-(٥٤٢٥)-((لَيْسَ لِلنِّساءِ وَسَطَ الطَّرِيقِ))

(حسن)(هب) عن ابى عمرو ابن حماس و عن ابى هريره ، الصحيحه ٨٥٦ ، حب ، المخلص ، عد .

## مانای فەرمودەکە

(٢٣٥)-(٥٤٢٥)-((ناوەندی ڕێ ؛ناوەڕاستی ڕێ؛ بۆ ئافرەتان نیه))(حەسەنە)(هـب)عن ابى عەمری کوڕی حەماس و ئەبی هورەیرە ڕیوایەتی کردووە (صەحیحە)٨٥٦ ، حب ، المخلص ،عد .

موناوی فەرمویەتی :بەڵکو لە تەنیشتی ڕێ دەڕۆن ، لەبەرئەوەی ڕۆیشتن بە ناوەندی ڕێ دا دەبێتە مایەی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ پیاوان .

(٣٦)-(٦٦٩٠)-((المَرأةُ عَوْرة ، فإذا خرجت اِسْتَشْرَفَها الشَّيطانُ))

(صحيح) (ت) عن ابن مسعود المشكاه ٣١٠٩ الإرواء ٢٧٣ .

## لێکدانەوی هەندێك لەوشەکان

عورە: هەمو ئەو ئەندامانەی کە شەرمی لێ دەکرێ گەر دەربکەوێت لە پیاودا ، کە لە نێوان ناوك و ئەژنۆیدایە ، وە لە ئافرەتیشدا هەمو لەشیەتی ، تەنها هەردوو لەپی دەست و دەم و چاوی نەبێ ،(و).

استشرفها : چاوتێ بڕین بۆ ئەوەی کە گومڕای بکات ، یان خەڵکی پێ گومڕا بکات .

## مانای فەرمودەکە

(٣٦)-(٦٦٩٠)-((ئافرەت مایەی ؛شەرم لێ کردنە؛ ئەگەر لە ماڵ دەرچوو شەیتان چاوی تێدەبڕێ بۆ ئەوەی کە گومڕایی بکات ، یان خەڵکی پێ گومڕا بکا))

(صەحیحە) (ت) لە ئیبنو مەسعودەوە گێڕاویی‌یەوە .میشکات ٣١٠٩، ئیروا ٢٧٣.

موناوی فەرمویەتی : ئافرەت؛ بەوە وەسف کراوە کە شەرمی لێ دەکرێت وە پێویستە خۆی داپۆشێ ، وە (عورە)لە بنەڕەتدا لە (عار)ەوە هاتوە واتە ئەو شتەی کە زەمی کراوە (فإذا خرجت)وە کاتێك کە لە ماڵەکەی دەرچوو ئەوا (استشرفها الشیطان) مەبەست لە شەیتانی ئادەمی‌یە بە مانای ئەوەی کە بابای تاوانکارو بەدکارئەگەر بینیان بەچاوەکانیان تەماحی تێ دەکەن ، وە لە بنەڕەتدا (استشراف) ە ....

(٢٣٧)-(٧٤٥٨)-(٢٦٣٢)-((لا تَمْنَعوا نساءَكُمْ المَساجِدَ و بُيتوهُنَّ خَيرٌ لَهُنَّ))

(صحيح)(حم ،د،ك)عن ابن عمر صحيح ابى داود ٥٧٦ ، الإرواء ٥١٥ .

## ماناى فەرمودەكە

(٢٣٧)-(٧٤٥٨)-(٢٦٣٢)-((ئافرەتەكانتان قەدەغە مەكەن لە مزگەوتەكان - وە نوێژ كردن -لە ماڵە كانيان چاكترە بۆ ئەوان))

(صحيحە) (حم، د،ك) لە ئيبنوعومەر گێڕاويانەتەوە . صەحيحى ئەبى داود ٥٧٦، ئيرواء ٥١٥

# ٤٦-داپۆشينى عەورەت

(٢٣٨)-(٥٥٨٣)(( مابَيْنَ السُرَّةِ والرُّكْبَةِ عَورة))

(حسن) (ك) عن عبدالله بن جعفر الروض ٣٧٧،الإرواء

(٢٣٨)-(٥٥٨٣)((نێوان ناوك ئەژنۆ عەورەتە)(حەسەنە) لەعەبدوڵاى كوڕى جەعفەرەوە گێڕاويەتەوە ، ڕەوض(٣٧٧)،ئيرواء (٢٩٢)

موناوى فەرمويەتى: داپۆشينى عەورەت مەرجە بۆ نوێژ لە -كاتى- تەنهايشدا ،وە سنوور لە نێوان جێ شەرمى پياو لەناوكەوە بۆ ئەژنۆيە،وەهى ئافرەتانيش -هەموولەشيان- تەنها دەم و چاو -ڕوو- و هەردوولەپى دەستيان نەبێ .

(٢٣٩)(٦٧١)((اذا صَليتم فاتَزروا ، وارتَدوا ولاتَشَبهوا بالْيَهودِ))

صحيح (عد) عن ابن عمر ، صحيح أبى داود (٦٤٥)حم ، د، الطحاوى ، هق.

## لێكدانەوەى هەندێك لەوشەكان

١- فاتزروا : ئيزرار لەبەر بكەن -ئيزرار- بەوە دەگوترێ كە لە خوار ڕا لەبەر دەكرێ و عەورەت دادەپۆشێ و درێژ بێ تا سەر گوێزينگان (و).

٢- ارتدوا : ڕيداء لەبەر بكەن ،ڕيداء بەوە دەگوترێ كە لەسەر ڕا لەبەر بكرێ و عەورەت داپۆشێ و جێى قۆڵى هەبێ و تا چۆكان درێژ بێتەوە ،

## ماناى فەرمودەكە

(٢٣٩)(٦٧١) ((ئەگەر نوێژتان كرد ئيزرار لەبەر بكەن و ڕيداء لەبەر بكەن ، خۆتان بە جوەكان مەچوێنن)).

(صەحيحە) (عد) لە ئيبنو عومەرەوە گێڕاويەتيەوە . صەحيحى ئەبى داود (٦٤٥) حم ،د،طەحاوى ،هق.

موناوى فەرمويەتى:ئەگەر ويستان نوێژ بكەن ئيزرار لەبەر بكەن و بەڕيداء داپۆشن ڕيداء ئەوەيە كەنێرينە لەبەرى دەكات .

(٢٤٠)(٧٣٨٣)-((لاتَقْبَلُ صَلاةُالحائِضِ الاَّ بِخِمارٍ))

(صحيح)(حم ، ت ،ه)عن عائشه المشكاه ٢٧٦٢ ، صحيح أبى داود ٦٤٨ ، الإرواء ١٩٦ .

## لێکدانەوەی هەندێ لەوشەکان

الحائض: ئافرەتی باڵق بالغ بوو .

خمار : پۆشاکێکە تەواوی سەری ئافرەت دادەپۆشێ بەڵام ڕووی نا .

## مانای فەرمودەکە

(٢٤٠)(٧٣٨٣)-((نوێژی ئافرەتی باڵغ قبوڵ ناکرێ مەگەر لە چکی بەسەرەوە بێ ، ؛و تەواوی سەری داپۆشێ؛))

(صەحیحە) (حم ، ت ،ه) لە عائشە گێڕاویانەتەوە ، میشکاە ٢٧٦٢ ، صەحیحی ئەبی داود ٦٤٨ ، ئیروا :١٩٦ .

ئیبن و حەجەر فەرموویەتی : حەقیقەتی قبوڵ بوون - ئەنجامدانی فەرمان و گوێ ڕایەڵی کردنە بۆ بە دەست هێنانی پاداشت و لەسەر لا چوونی ئەو ئەرکەیە وە کردنی بەو مەرجانە زامنی پاداشتە .

موناوی فەرموویەتی : بۆیە تایبەتی کردووە (بە حەیز)چوونکە بەشی هەرەزۆری ئافرەتان لە کاتی باڵغ بوونیاندا توشی حەیز دەبن (الطیبي)فەرموویەتی: وەکو ئەوە وایە کە بڵێ ئەو کچەی کە باڵغ بووە با سەری داپۆشێ .

(٢٤١)(٧٧٢٦_٢٨٣٧)((لايُصلّيِ احَدُكُم فِي الثّوبِ الواحِدِ لَيْسَ على عاتقهِ مِنْهُ شَيْء ))

(صحيح)(حم،ق،د،ن) عن أبي هريرة . صحيح ابي داود (٦٣٧) الإرواء (٢٧٥) .

## لێکدانەوەی هەندێك لەوشەکان

عاتقه : شانی

## مانای فەرمودەکە

(٢٤١)(٧٧٢٦)(٢٨٣٧)((بامیچ کام لەئێوە لەیەك پۆشاکدا نوێژ نەکا -کەشتێك- لەو پۆشاکە لەنێوان شانو ملی -گەردن دا- نەبێ))

(صەحیحە)(حم ، ت ، د،ن) لە ئەبی هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە . صەحیحیئەبی داود٦٣٧ ، ئیروا ٢٧٥.

# ٤٧- ڕووگە (القبله) و بەربەست (السترە)و ئەوەی کە پێیانەوە پەیوەستن .

(٢٤٢)(٥٥٨٤)-((ما بَينَ المَشرِقِ و المَغرِبِ قِبْلَةٌ))

(صحيح) (ت،م،ك)عن ابى هريره ، المشكاه ٧١٥، الإرواء٢٩٢ .

## مانای فەرمودەکە

(٢٤٢)(٥٥٨٤)-((ڕووگە لە نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادایە))

(صەحیحە)(ت،م ،ك)لە ئەبی هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە . میشکات ٧١٥ ، ئیروا :٢٩٢ .

علی حسن فەرمویەتی :قسەی زۆری لەسەرن بەڵام قسەکە لەگەڵ ئەهلی مەدینەیە .

(٢٤٣)(٦٥٠)(٢٩٥)-((إذا صَلَّىٰ أحَدُكُمْ فَلْيصَلِّ إلى سُتْرَةٍ وَ لْيَدْنُ مِنْ سُتْرَتِهِ لا يَقْطَعِ الشَّيطانُ عَلَيهِ صَلاتَهِ)) .

(صحيح) (حم ، ن ، حب ، ك ، ك) عن سهل بن أبي حثمة .المشكاه ٧٨٢ ، صحيح أبي داود ٦٩٢ . الصحيحه ١٣٧٢ ، هق

## مانای فەرمودەکە

(٢٤٣)(٦٥٠)(٢٩٥)-((ئەگەر هەر یەکێکتان نوێژی کرد با ڕووەو بەربەستێك نوێژ بکات وە لەبەربەستەکەی نزیك کەوێتەوە بۆ ئەوەی شەیتان نوێژەکە لە نوێژکارەکە نەپچڕێنێ :نەبڕێ:))

(صەحیحە)(حم ، د،ن، حب ، ك)لە سەهلی بنی ئەبی حەسمەوە گێراویانەتەوە میشکات ٧٨٢ ، صەحیحی أبی داود ٦٩٢ ، صەحیحە ١٣٧٣ هق.

موداری فەرمویەتی :ئەگەر یەکێکتان ویستی نوێژ بکات جا ئەو نوێژە سونەت بو یان فەرز باڕووە و کۆڵەکەیەك یان گۆچانێك یان هەر شتێکی تر بیکات با لە ڕمێکیش باریك تر بێت (ولیدن من سترته) باڵێ نزیك بێتەوە زۆر دوور نەبێ لێ وە نێوان خۆی و بەربەستەکەی با لەسێ باسك (ذراع)[4] زیاتر نەبێ وە نێوانی ڕیزەکانیش بە هەمان شیوە ، (لا يقطع) بۆ ئەوەی نوێژەکەی پێ نەبڕێت ((الشيطان) ئەوەی کە تێدەپەڕێت _ بە بەردەم نوێژکەر دا _ ، بۆیە پێی دەوترێ شەیتان چونکە کارێك دەکا کە کاری شەیتانە .

بە تێپەڕبوونی بابای نوێژکەر سەر قاڵ دەکاو ، یاخود لەبەر ئەوەی شەیتان هاندەریەتی بۆ ئەوەی ئەم کارە بکا .

_هەروەها _ ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە ڕۆیشتن بە بەردەمی نوێژکەردا حەرامە ئەگەر بەربەستی دانا بوو ، خۆ ئەگەر لەسەر ڕێی خەڵکی وەوستا بوو ، وە بەربەستی دانەنا بوو ، ئەوا ڕۆیشتن بە پێشی دا حەرام نییە بەڵام چاکتر وایە کەس بەپێشی دا نەڕوات

[4] لەسەر پەنجەی دەستەوە تا ئانیشك پێی دەوترێت (ذراع)

(تێنەپەڕێت) ، ئەمەش ئاگادارکردنەوەیە لەسەر گەورەیی نوێژ و ئەو کەسەی کە نوێژ دەکا .

مەشهور حەسەن فەرموویەتی : دروست نییە کێشانی هێڵ (خط) و دیاری کردنی لەگەڵ تواناداو بوونی بەردەست دەکەوتنی جگە لە هێڵ ، جا ئەگەر گۆچانێك بێت یان کەلوپەلی ماڵەوە بێت یان تەختە دارێك بێت یان گڵ بێت هەتا ئەگەر کۆمەڵە بەردێکی وورد بێت هەندێکیان بخەیتە سەر هەندێکیان هەر وەکو (سلمة بن الاكوع) کردوویەتی ڕەزای خوای لێ بێ ئەوەی کە شایەنی باس کردنە ئەوەیە کە ، فەرموودەی کێشانی هێڵ بۆ بەربەست بێهێزە (ضعیف)ە ئەوانەی ئاماژەیان کردووە بۆ لاوازیەکەی سوفیان وە ئیبن وو عویەینە و شافعی وە بەغەوی و جگە لە وانیش .

وە (الدار قطنی) دەفەرمووێ :- فەرموودەکە - صەحیح و جێگیر نییە ، وە ئیمام شافعی - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرمووێ : باهێڵ نەکێشێ بابای نوێژەکەر کە لەپێش خۆی هیچ هێڵێك ئیلا کاتێك وابکە فەرموودەیەکی جێگیر (ثابت) هەبێ ، جا ئەو کاتە با شوێنی بکەوێ . وە ئیمام مالیك - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - لە (المدونە) دا دەفەرمووێ : ( - کێشانی - هێڵ - بۆ بەربەست - بە تاڵ (باطل)ە) ئەوانەی ولزیان زانیوە لە زانایانی دوای سەلەف _ ڕەحمەتی خوایان لێ بێت _ وەکو : ئیبن و صەلاح و نەوەوی و عێراقی و جگە لەوانیش .

شەوکانی _ ڕەحمەتی خوای لێ بێت _ لە (نیل الاوطار) (٣،٢٣) دا دەفەرمووێ : تێی دایە (ئەوە دەگەیەنێ) (واتە لە فەرمودەکەدا) کە دانانی بەربەست واجبە .

ئیبن مەسعود _ ڕەزای خوای لێ بێ _ دەفەرموێت : چوار شت هەن لە بەد بەختی مرۆڤن :- یەکێك لێیان _ کە مرۆڤ نوێژ بکات بەبێ بەربەست ، ...) اخرجە إبن ابی شیبة فی (المنصف) والبهیهقی في السنن وهو (صحیح) .

**٢٤٤ - ٧٥٥ - ٣٥٧ ((إذا كانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَلا يَدَعْ أَحَداً يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيهِ وليَدْرَأهُ ما استَطاعَ فإنْ أبىٰ فليقاتِلهُ ، فإنَّ مَعَه القرين)) .**

(صحيح) (حم ، م ، ه) عن إبن عمر صحيح الترغيب ٥٦١ (وذادخ ، د ، ت ، نحوه)

## لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

١. فلا يدع : بارێ نەدا (و) .
٢. يمر : تێپەڕێ ، بڕوا (و) .
٣. وليدراه : وەباپاڵی پێوە بنێ .
٤. القرين : شەیتان

## ماناى فەرموودەكە

٢٤٤ _ ٧٥٥ _ ٣٥٧ ((ئەگەر هەر یەكێكتان لە نوێژدا بوو ، باڕێ _ نەدا هیچ كەسێك بەبەردەستەكانی دا _ بەبەردەمی دا _ بڕوا ، با بیگرێتەوە و _ پالی پێوە بنێ ئەوەندەی دەتوانێ ، گەر پشتی هەلكرد _ لە گەڕانەوە و نەگەڕایەوە _ با لەگەلی دا بجەنگێ _ و بەزۆر بیگەڕێنێتەوە _ چونكە بەدلنیاییەوە شەیتانی _ هاوەلە و _ لەگەلیدایە)) .

(صحیحە) (حم ، م ، ە) لە ئیبن عمرەوە گێڕاویانەتەوە صەحیحی تەرغیب ٥٦١ (وزاد خ ، د ، ت ، نحوه)

٢٤٥ _ ٥٣٣٧ _ ((لَوْ يَعْلَمُ المارّ بيْنَ يَدَي المُصَلِّي ماذا عَلَيهِ لَكانَ أنْ يَقِفَ اربعينَ خَيْراً لَهُ من أن يَمُرَّ بيْنَ يَدَيه))

(صحيح) (مالك ، ق ، ع ، عن إبن جهيم) . صفة الصلاة ص ٦٥ ، مختصر مسلم ٣٣٧ ، صحيح ابى داواد ٦٩٨ .

## ماناى فەرموودەكە

٢٤٥ _ ٥٣٣٧ _ ئەگەر دەیزانی ئەو كەسەی گوزەر دەكا بەبەردەم نوێژكاردا كەچی لەسەرەوە ، چل _ پایز _ سال _ وەستا با چاكتر بوو بۆی وەك لەوەی بەبەردەستەكانی دا _ بەبەردەمی دا بڕوا))

(صەحیحە) (مالك ، ق ، ع) لە ئەبی جوهیمەوە وەرگێڕاویانەتەوە . صیفەتوصلات ل ٦٥ ، موختەصەری مسلم ٣٣٧ ، صەحیحی ابی داود ٦٩٨ .

ڕوناوی فەرموویەتی : بۆیە باسی دەستەكانی كردووە ، چونكە بەزۆری بەدەستەكانی ئەوكەسە دەگێڕێتەوە كە دەیەوێ گوزەركا ، (زین العراقی) فەرموویەتی ئەگەر ئەو كەسە بە نێوان نوێژكەرو بەربەستەكەیدا تێپەڕێ یاخود ئەگەر بەربەست نەبوو ، ئەوا سێ باسكە با بەندازە دادەنرێ بۆی . (ماذا علیه) لە ڕیوایەتێك دا هاتووە كە چ تاوانێكی لەسەرە بەلام ئیبنو صەلاح ئینكاری كردووە ، (ما ) لێرەدا بۆ پرسیار كردنە وە بۆیە بە پرسیار هێناویەتی شتكەی شاردۆتەوە ، بۆ قەبارە پێدان و گەورە كردنە ، وە وەلامی (لو) لابراوە واتە ، گەر دەیزانی دەوەستا ، وە ئەگەور وەستا با چاكتر بوو بۆی (لكان ان يقف اربعين) وە لە ڕیوایەتی (بەزار) دا هاتووە كە (اربعين خريفاً خيراً له) ، باشتربوو بۆی وەك لەوەی كە (ان تمر بين يديه) واتە : ئەگەر ئەندازەی تاوانەكەی دەزانی وە دەیزانی چی بەدواوەیە ئەوا وەستانی ئەو مادە دوورو درێژەی هەلدەبژارد .

٢٤٦ _ ٥٤٥٨ ((لِيَضَعْ احدُكُم بَيْنَ يدَيهِ مِثْلُ مؤخرةالرّحلُ ولايَضُرُّهُ مامَرَّ بيْنَ يَدَيه))

(صحيح) (القياسى ، حب) عن طلحة . صفة الصلاة ٦٣ ، صحيح ابي داود ٦٨٦ : حم ، م ، د ، ت ، ه ، هق)

## لێکدانەوەی هەندێک لەوشەکان .

١. لیضع : بادای بنێ

٢. مؤخرة : بەو دارە دەوترێ کە پاڵی پێوە دەدرێ لە کاتی سواربووندا ، پاش بار ، وەبەرزیەکەی سێیەکی باسکێکە (ذراع) .

### مانای فەرموودەکە

٢٤٦ _ ٥٤٥٨ ((بالەنێوان _ لە بەردەستەکانی بە وێنەی پاش بارێک دابنێ ، وە زیانی پێناگەیەنی _ ئەوەی کە تێدەپەڕێ بە نێوان دەستەکانی دا ))

(صەحیحە) (الطیالیسی ، حب) لە طەلحەوە گێڕاویانەتەوە،صیفەتوصەلات ل ٦٣ ، صەحیحی ئەبی داود ٦٨٦ : حم ، م ، د ، ت ، ھ ، ھق)

موناوی فەرموویەتی :هەرکەسێ ویستی نوێژ بکا بالە پێش خۆی بەربەستێک دابنێ ، لای کەم بەئەندازەی پاش بارێک بەرز بێت ئەوکاتە زیان لە نوێژەکەی نادات ئەوەی کە تێدەپەڕێ بەو دیو بەربەستەکەدا .

## ٢٤٧_ ٦٨٩٣ ((نَهىٰ عَنِ الصَّلاةِ إلىٰ القُبور)) .

### مانای فەرموودەکە

٢٤٧ _ ٦٨٩٣ ((نەهی کردووە لەوەی کە نوێژ ڕووەو گۆڕان _ گۆڕەکان بکرێ))

(صەحیحە) (حب) لە ئەنەسەوە گێڕاویەتەوە .

موناوی فەرموویەتی : ئەم فەرموودەیە _ وریا کردنەوەی ئوممەتەکەیەتی لەوەی کە گۆڕەکەی بە گەورە بزانن یاخود گۆڕی هەر پیاو چاکێکی تر ، وە ئەوەی لێ وەردەگیرێ ، کە نابێ نوێژ لەناو گۆڕەستانەکەدا بکرێ .

## ٢٤٨ _ ٧٣٤٩ ((لاتُصَلّوا خَلفَ النّائم ، ولاالمُتَحَدِّث))

(حسن) (د ، هق) لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاویانەتەوە ئیرواء: ٣٧٥

موناوی فەرموویەتی :فەرموودەی تر هەیە کە صەحیحە و عائیشەوە لەبەردەم پێغەمبەری خوا نستووە و ئەویش نوێژی کردووە ، کەمال : فەرموویەتی وەڵام بۆ ئەمە ئەوەیە ئەو نەهی‌یە بۆ کاتێکە گەر نستووەکە دەنگی لێ بێ _ پرخەی بێ و نوێژکەرەکە لە نوێژەکەی بێ ئاگا بکا _ وە بەشی دووەم کۆتایی فەرموودەکە (ولاالمتحدث) واتە ، نوێژ مەکەن لە دوای قسەکەرە چونکە شتێکی ئاشکرایە بەهۆی دەنگ هەڵبڕین قسەی نابەجێو پێ بکەنێ و گوفتار دەربارەی شتی و دونیایی وە هەر قسەیەکی تر زەینی نوێژکەر دەپچڕێن و بێ ئاگای دەکات .

## ٤٨ _ خشوع لە نوێژداو ڕێگرەکانی

٢٤٩ _ ٢٩٩ ((إذا أرادَ أحدُكُم أن يَذهَبَ إلى الخَلاءِ وأقيمَتِ الصَّلاة فَليَذهبْ إلىٰ الخلاء))

(صحيحه) (حم ، د ، ن ، ه ، حب ، ك) عن عبدالله إبن ارقم .صحيح السنن ٨٠ .

### لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

الخلاء : شوێنی خۆ خاڵی کردنی (قضاء الحاجة ، إلاستطابة ،البراز إلاستجاب) هەموو ئەمانە بەکاردەهێنرێن بۆ جێبەجێ کردنی پێویستی خۆخاڵی کردن لەپاشەڕۆك و چوونە ئاو دەست ..

### مانای فەرموودەکە

٢٤٩ _ ٢٩٩ ((ئەگەر هەر یەکێکتان ویستی بچێتە خەلا _ ئاو دەست _ و قامەتیش دەکرا بۆ نوێژ بابچێ بۆ خەلا _ ئاو دەست _ ))

(صەحیحە) (حم ، د ، ن ، ، حب ، ك) لە عبدالله بنی ئەرقەم گێڕاویانەتەوە . صەحیحی سونەن ٨٠ .

<u>موناوی فەرموویەتی</u> : سوننەتە بچێ بۆ خەلا بەر لەوەی نوێژ بکا ، کە دڵنیا بوو لەوەی کە کاتەکەی بەسەر ناچێ ، بۆ ئەوەی خۆی خاڵی کا ، لەبەر ئەوەی گەر نوێژ بکا دەبێتە مایەی تەنگاو بوونی و سەر قاڵ کردنی و بێ ئاگا بوونی لە نوێژو خشوع ناهێڵێ .

٢٥٠ _ ٨١٣ _ ٣٨٤ ((إذا نَعَسَ الرَّجُلُ وهُوَ يُصلِّي فَلْيَنْصَرِفْ لَعَلَّه يَدْعو عَلىٰ نَفْسِهِ وَهُوَ لا يَدْري))

(صحيح) (ن ، حب) عن عائيشة صحيح ابي داود ١١٨٣

### لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

١. نعس : وەنەوزی دا ، خەوبردیەوە .

٢. فلينصرف : باولزبهێنێ ، بڕوا .

### مانای فەرموودەکە

٢٥٠ _ ٨١٣ _ ٣٨٤ ((ئەگەر پیاوێك نوێژی دەکردو خەو بردیەوە باولزبهێنێ _ لەوانەیە توك _ دوعا لە خۆی بکاو ئەو کەسە نەشزانێ))

(صەحیح) (ن ، حب) لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە ، صەحیحی ابی داود ١١٨٣

<u>موناوی فەرموویەتی</u> : هەر نوێژێك بێت فەرز بێ یاخود سوننەت ، وەلە ڕیوایەتی تردا هاتووە کە بابچێ بنوێ و ڕاکشێ .

٢٥٠ _ ٨٦٤ _ ٤٤١ ((إذْهَبوا بهذهِ الخَميصَة إلى أبي جَهْم بنْ حُذَيفَة وأتواني بأنْبجانِيَتـه فإنما الهتْنِي آنفاً في صَلاتي))

(صحيح) (ق ، د ، ن ، ه) عن عائيشة .صحيح أبى داود ٨٤٨ ، إلاوراء ٣٧٦ ، مختصر مسلم ٢٣٢ .

## لێكدانەوەی هەندێك لەووشەكان

الخميصە : پۆشاكێكی خۆریە ڕەنگا و ڕەنگ نەخشێنراوە .

إنبجانیە : پۆشاكێكە لە خوری دروست كراوە بەڵام ڕەنگاو ڕەنگ نیە پاڵدەدرێتە ئەو شوێنەی كەلێی دروستكراوە كە (انبجان)ە .

الهتنی : بێ ئاگای كردم ، سەرقاڵی كردم .

٢٥١ _ ٨٦٤ _ ٤٢١ ((بڕۆن ئەو خەمیصەیە بەرن بۆلای ئەبی جەهمی كوڕی حوزەیفە وە ئینبیجانیەكەیم بۆ بهێنن _ چونكە _ ئەو _ خەمیصەیە _ پیشتر لەنوێژەكەی بێ ئاگا كردم))

(صەحیحە) (ق ، د ، ن ، ه) لە لە عائیشە گێڕاویانەتەوە . صەحیحی ئەبی داودە ٨٢٨ ، ئیبرداء ٣٧٦ موختەصەری موسلیم ٢٣٢ .

٢٥٢ _ ١١١٨ ((أفْضَلُ الصَّلاة طولَ القُنوتِ))

(صحيح) (حم ، م ، ت ، ه) عن جابر (طب) عن أبى موسى وعن عمر بن عسبة وعن عمر بن قتادة الليثى .

إلاروراء : ٤٥٨ ، صحيح أبى داود ١١٩٦ ، حم ، د ، ن ، الدارمي

## لێكدانەوەی هەندێك لە ووشەكان

القنوت : وەستان

## مانای فەرموودەكە

٢٥٢ _ ١١١٨ ((باشترینی نوێژ _ ئەو نوێژەیە _ كە درێژترین وەستانی _ تێدایە _))

(صەحیحە) (حم ، م ، ت ، ه) لە جابر ، (طب) لە ئەبی موسا و لە عەمری كوڕی عەبەسەوە لە عومەیری كوڕی قەتادەی لە یسی یەوە گێڕاویانەتەوە .

ئیرواو ٤٥٨ ، صەحیحی ئەبی داود ١١٩٦ _ حم ، د ، ن ، دارمی لە عبداللە ی كوڕی حەبیی یەوە گێڕاویانەتەوە . صەحیحە: ا ەە .

<u>موناوی فەرموویەتی</u> : چاكترین نوێژ ئەو نوێژەیە كە زیاتر بەپێوەتێیدا بوەستی لەبەر ئەوەی شوێنی قورئان خوێندنە ، وە (قونوت) یانزە مانی هەیە ، وە ئیمامی نەوەوی وتویەتی : لێرەدا مەبەست لەبەپێوە وەستانە زانایان یەك ڕان لەسەری .

٢٥٣ _ ١٥٣٨ ((إنَّ أحدَكُم إذا قام يُصَلّي إنّما يناجي رَبَّه فلينظُر كيفَ يُناجيهِ))

(صحيح) (ك) عن أبى هريرة الصحيحة ١٦٠٣ .

<u>موناوی فەرموویەتی</u> :کاتێك هەریەکێکتان هەستا نوێژ بکا جا ئەو نوێژە فەرزی بێ یان یا سوننەت ئەوا ئەو کەس (یناجی ربە) پەروەردگاری دەدوێنێ ، دواندنەکەش لەو ڕووەوەیە کە یادی دەکاو قورئان دەخوێنێ وە دواندنی پەروەردگاریش بۆ ئەو ویستی خەیرە (فلینظر کیف نیاجی ربە) واتە بابیر بکاتەوە بزانێ چ وەڵامێکی هەیە بۆ بەگەورە زانین و بەپیرۆز زانینی خوا بە دڵ و بەزمان و بەڕووتێکردنی بە پاکی و بەتەنها لە پەرستنی داو ، خاڵی کردنی دڵی بۆ یادی خواو بیرکردنەوە لەوەی کە دەیخوێنێ ، ئەو فەرموودەیە دا کۆکی دەکات لەسەر پاکی دڵ و دەروون و بەتاڵ کردنی لەشی دونیایی لەکاتی نوێژدا .

٢٥٤ _ ٧٥٠٩ ((لاصَلاةَ بحضْرَةِ طعامٍ ، ولا وَهُوَ يدافِعه الاخبَثان))

(صحيح) (م ، د) عن عائيشة الارواء ٥٥٠

## لێکدانەوەی هەندێك لەوشەکان

الاخبثان : پیسیەکان ، کەمەبەست لە میزو پاشەڕیە .

## مانای فەرموودەکە

٢٥٤ _ ٧٥٠٩ ((با ، کەس ، نوێژنەکا لە کاتی ئامادەبوونی خواردن ، و دانرانی ، وەبا هیچ کەسێك نوێژ نەکا کە پیسیەکان پاڵی پێوە بنێن و تەنگاو بێ))

(صەحیحە) (م ، د) لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە ئیرواء ٥٥٠

<u>موناوی فەرموویەتی</u> : با هیچ کەسێك نوێژنەکات _ کاتێك _ خواردن دانرا یاخود کە تەنگاو بوو ، جا تەنها میزی بێ یاخود هەردووکیان یان ئەوی تریان چونکە ئەوە سەرقاڵی دەکاو خشوع [*] لە نوێژدا نامێڵێ ، وە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە ئامادەبوونی دڵ چاکترە وەك لە نوێژ کردن لە یەکەمی کاتەکەی دا ، نەك هەر خواردن و تەنگا و بوون بگرە هەرچی ببێتە مایەی بێ ئاگابوون وەکو توڕەی و ئەو بابەتانەش یان تینویەتیەکی زۆر ، وە دیارە _ ئەو حاڵەتانەی کە باس کران نوێژکردن تیایدا _ نوێژەکە بەتاڵ نابێتەوە ، بەڵام چاك نیە ، وەجمهوری عولەما لەسەر ئەوەن کە پاداشتی نوێژی تەواو بۆ ئەو کەسە نیە لەو حاڵەتانەدا نوێژ بکا .

---

[*] خشوع لە نوێژدا : ئامادەبوونی دڵ و ئارام بوونیەتی ، کەم کردنەوەی جووڵەو ئاوڕانەوەیە ، وەکو ئەدەبێك لە بەرامبەر خوادا ، و بزانێ کە چی دەڵێ لە سەرەتادا تا کۆتایی ، وە بزانێ کەچ دەکا ، بەمەش دڵەڕاوکێی خەیاڵی پوچ بنە بڕ دەکا ، ئەوە گیانی نوێژەو ، ئەوەش مەبەستە لە کردنی نوێژدا ، وە پاداشتی نوێژیش بە ئەندازەی بوونی خشوعە تێیدا .

# ٤٩ _ چۆنیەتی نوێژ

٢٥٥ _ ٧٤١ _ ٣٤٩ ((إذا قمتَ إلى الصَّلاة فأسبغ الوُضوء ، ثم آستقبل القِبْلةَ فَكبِّر ، ثم آقرء ماتَيَسَّر مَعَكَ مِنَ القرآنِ ، ثُمَّ اركعْ حتى تَطمَئِن راكِعاً ، ثم إرفع حتىٰ تَعدِل قائِماً ، ثم اسجد حتىٰ تطمئِنَ ساجِداً ، ثم ارفَعْ حتى تطمئِنْ جالساً ، ثم اسجد حتىٰ تطمئِنْ ساجِداً ثم افعَلْ ذلكَ في صلاتِكَ كُلِها))

(صحيح) (حم ، ق ، ٣) عن ابي هريرة . صحيح ابي داود ٨٠٢ ، إلارواء ٣٠٠ ، صفة الصلاة ٢٧٩ ، مختصر مسلم ٢٨٢ .

## لێكدانەوەی هەندێك لەووشەكان

ماتيسر مع القران : ئەوە كە لات ئاسانە زانینی لە قورئان مەبەستی پێ لە فاتیحایە ، لەبەر ئەوەی كە ئاسانترین سورەتە لە قورئاندا لەبەر بكرێ (و) .

ركوع : چەمانەوەی پشتە لە پێشدا تادەستەكان دەگەنە ئەژنۆ بە تەواویش ئەوەیە كە سەروپشت لەیەك ئاست دابن لە كاتی چەمانەوەدا .

تطمئن : لە جوولە دەكەوێ (و) .

## مانای فەرموودەكە

٢٥٥ _ (٧٤ _ ٣٤٩) ((كاتێك هەستای بۆ نوێژ دەست نوێژێكی تێرو تەسەل بگرە پاشان ڕوبكە ڕوگە (الله اكبر) بكە پاشان ئەوە بخوێنە كە □ لەبەرتە – لە گەڵتایە و ئاسانە لە قورئان ، پاشان بچەمەوە تا ئارام دەگرێ و جووڵەت لێ دەبڕێ بە چەمانەوە ، پاشان بەرزبەوە – هەستەوە –هەتا ڕاست دەبێەوە بەپێوە كڕنوش بەرەهەتا ئارام دەگری و جووڵەت لێ دەبڕێ و ئارام دەگری لەدانیشتندا پاشان كڕنووش بەرە _ جارێكی تر _ تا جووڵەت لێ دەبڕێ بەكڕنووش بردن ، پاشان ئەوانە بكە لە هەموو نوێژەكانت دا))

(صەحیحە) (حم ، ق ، ٣) لە ئەبوو هریرەوە گێڕاویانەتەوە . صەحیحی ئەبی داود ٨٠٢ ، ئیرواء ٣٠٠ ، صیفە تو صلات ٢٧٩ ، موختەصەری مسلم ٢٨٢ .

صەنعانی <u>فەرموویەتی</u> :پێغەمبەر خوا ئەوەی فەرموو ، دەربارەی ئەو كەسەی كەلە نوێژەكەی دا هەڵەی كرد (مسيء صلاته) كەناوی (خلاد بن رافع)بو ، (السباغ الوضوء) تەواو شوشتنی ئەندامەكانە ، (فكبر) مەبەست لە (الله اكبر) ی سەرەتای نوێژدابەستنە ، (ثم اقرء ماتيسر معك من القرآن) ئەوەی لێ دەفامرێتەوە كە (دعاء الاستفتاح) پێویست (واجب) نیە خۆ ئەگەر پێویست با ئەوا فەرمانی پێدەكرد ، (ثم اركع حتى تطمئن راكعا) پێویستیەتی ڕكوع دەگەیەنێ لەگەڵ بڕانی جووڵە لەگەڵی دا ، (ثم إرفع) هەستەوە لە ڕكوع (حتى تعتدل قائما) هەتا بە تەواوی ڕاست دەبیەوە و ئێسكەكانت دەگەڕێنەوە جێی خۆیان ، (ثم اسجد حتى تطمئن ساجد) ئەوەی لێ وەردەگیرێت كە كڕنوش بردن و

جوولە بڕان تێیدا پێویستە ، (ثم إرفع من السجود) پاشان هەستەوە لە کڕنووش بردن (حتى تطمئن جالسا) تا بە دانیشتنەوە جوڵەت لێ دەبڕێ ، دوای کڕنوشی یەکەم (ثم اسجد) پاشان کڕنووشی دووەم بەرە ، (حتى تطمئن ساجدا) تا ئارام گرتوو دەبێ و جوڵەت لێ دەبڕێ لە کڕنووشدا ، بێگومان ئەوە سیفەتی هەموو ڕەکەعەتێکە لەهەموو نوێژەکاندا ..

بەغەویش دەفەرمووێ : (بۆیە باسی ئەرکانەکانی تری نەکردووە وەکو (التشهد) و صەلاوەت دان لە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوەی لای پرسیار کەرەکە زانراوە .

سەبارەت بەخوێندنی فاتحە (آل بسام) ووتویەتی : جمهورەی عولەما ___ لەسەر ئەوەن کەنوێژ بێ فاتحە دروست نییە بۆ ئەو کەسەی کە دەیزانێ .

٢٥٦ – ٣٠٣٨ ((ثَلاثٌ مِنْ اخلاقِ النُّبُوَّةِ تَعَجِلُ الافْطَار ، وَتَأْخِيرُ السُّحور ، وَ وَضْعِ اليَمِينِ علىٰ الشِّمالِ في الصَّلاةِ))

(صحيح) (طب) عن أبي الدرداء مجمع الزوائد ٢/١٠٥ .

## ماناى فەرموودەکە

٢٥٦ – ٣٠٣٨ ((سێ ڕەوشت لەڕەوشتەکانی پێغەمبەریەتین پەلە کردن لە ئیفتار کردنەوە (بەربانگ) ، وە دوا خستنی پارشێوو ، وە دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لەنوێژدا))

(صەحیحە) (طب) لە أبي الدرداء گێڕاویانەتەوە . موجەمەعی زەوائد ٢ / ١٠٥ .

موناوی فەرموویەتی : زوو ڕۆژ و شکاندن دوای ئاوا بوونی خۆر ، دوانە خستنی تا دەرکەوتنی ئەستێرەکان وەکو ئەهلی کیتاب دەیکەن ،وە دوا خستنی پارشێوو تا نزیکی بەرە بەیان ، وە دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ و گرتنی بە دەستی ڕاست .

ئەوەی شایەنی باسە کەکاتی ڕۆژ و شکاندن ئاوا بوونی خۆرە نەك دوای بانگ ، بەڵام بەداخەوە ئەوە بووە بە عادەت .

٢٥٧ – ٤٦٦٧ ((كان إذا استَفْتَحَ الصَّلاةَ قالَ : سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وبِحَمْدِكَ و تبارَكَ اسْمُكَ وتَعالىٰ جَدُّك ولاإِلٰهَ غَيرُكَ))

(صحيح) (د ، ت ، هـ ، ك) عن عائيشة (ق ، هـ ، ك) عن أبي سعيد (طب) عن إبن مسعود و عن واثلة ، المشكاة ٨١٥ ، الإرواء ٣٤١ .

## ماناى فەرموودەکە

٢٥٧ ___ ٦٦٧ ((کاتێك کە نوێژی دەست پێدەکرد دەی فەرموو : ((سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك إسمك وتعالى جدك ولا إله غيرك))

(صەحیحە) (د، ت ، هـ ، ك) لە عائیشەوە (ق ، هـ ، ك) لە ئەبی سەعید و (گب) لە إبن و مەسعود و لە واپڵەوە گێڕاویانەتەوە . مشكاه ٨١٥ ئیرواو ٣٤٨ .

موناوی فەرموویەتی : کاتێك کەنوێژی دابەستبا سەرەتا دوای (الله اکبر)ی نوێژ دابەستن بەوە دەستی پێ دەکرد ئەم فەرموودەیە زیاتر حەنبەلەییەکان بەکاری بەکاری دەهێنن لەسەرەتای نوێژ ، بەڵام شافیعی بەلایەوە سوننەت بووە (وجهت و جهی) بخوێنرێ . بێگومان هەردووکیان هەر دەبن .

٢٥٨ – ٥٨٨٥ ((مِفتاحُ الصَّلاةِ الطُّهُور وتَحْريمُها التَّكبير وتَحْليلُها التَّسليمُ))

(صحيح) (حم ، د ، ، ت، ه) عن علي . المشكاة ٣١٢ ، صحيح ابي داود ٥٥ ، الإرواء ٣٠١ ، صفة الصلاة ، ص ٦٦ .

## مانای فەرموودەکە

٢٥٨ ___ ٥٨٨٥ (( کلیلی – چوونە ناو – نوێژەوە دەست نوێژە وە حەرام کردنیشی ___ لە جگە لەو شتنانەی کە دروستن لەنوێژدا ، ( الله اکبر)ی نوێژدابەستنە ، حەڵاڵ کردنیشی سەلام دانەوەیە))

(صەحیحە) (حم ، ت ، د ، ه) لە عەلیەوە گێڕاویانەتەوە . میشکاە ٣١٢ ، صحیح ابی داود ، ٥٥ الارواو ، صفه الصلاه ، ص ٦٦ .

موناوی فەرموویەتی :(مفتاح) ئەوەی کە ڕێ دەدا بۆچوونە ناو نوێژ دەست نوێژەو ، وەلە بنەڕەتدا (تحريم) ڕێی پێ نەدان و قەدەغە کردنە ___ مەبەست لەوەیە کەهەر قسەیەك بکرێ یان هەر کارێك کەلەناو نوێژەکەدا نەبێ دوای (الله اکبر)ی یەکەم حەرام دەبێ کردنی ، ئەوەی لێی دەفامرێتەوە بەغەیری (الله اکبر) نوێژ دانابەسترێ ئەمە مەزهەبی سێ پێشەواکانە ، بەڵام ابو حەنیفە وتوویەتی ، بەهەموو دەر بڕینێك دادەبەسترێ و دەکرێ کە مەبەستی بە گەورە زانین بێ وە ووتویانە (الله اکبر) لەتایبەت مەندیەکانی ئەم ئۆمەتەیە ، وە سەلام دانەوەش لەنوێژ ئەو شتانە حەڵاڵ دەکات کە نابێ لەنوێژدا بکرێت وەکو خواردن و خواردنەوە وە قسە کردن ... هتد . وە ئەو فەرموودە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە ئەوانەی باس کران تێیدا پێویستن لەنوێژدا .

## ٥٠ - گەورەیی نوێژ کردن بەپێوە ،لەبەرامبەر ئەو کەسەی بەدانیشتنەوە نوێژ دەکا .

٢٥٩ ـ ٣٧٧٧ ((صَلِّ قائِما ، إلا ان تخافَ الغَرَقَ)) .

(صحيح) (ك) عن إبن عمر صفه الصلاه : ٥٩ البزار ، قط .

## مانای فەرموودەکە

٢٥٩ـ ٣٧٧٧ ((بە پێوە نوێژ بکە ، مەگەر لەنقوم بوون بترسی)) .

(صەحیحە) (ك) لە ئبنو عومەرەوە گێڕاویەتەوە صفة الصلاة : ٥٩ ، البزار ،قط .

موناوی فەرموویەتی :بە پێوە نوێژ بکەن ، لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە (یا من سألنا كيف يصلي في السفينة) (ئەی ئەوەی پرسیاری لێ کردین کە چۆن نوێژ بکات لەناو کەشتی دا) ، بە پێوە نوێژ بکا مەگەر بترسی لەوەی سەرت بسوڕێ و بکەویتە ناو دەریاوە ئەگەر بەپێوە بوەستێ ، ئەو فەرموودە ئەوەی تێدایە کە لەکاتی پێویستی و ناچاری دا دانیشتن لە نوێژی فەرزدا دەبێ .

٢٦٠ ـ ٣٧٧٨ ((صَلِّ قائِماً ، فإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فقاعداً ، فإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعلىٰ جَنْبٍ)) .

(صحيح) (حم ، خ ، ٤) عن عمران بن حصين .صحيح ابي داود ٨٧٨ ، الإرواء ٢٩٩ ، ٥٥٧ .

## مانای فەرموودەکە

٢٦٠ـ ٣٧٧٨(( بەپێوە نوێژ بکە ، ئەگەر نەتوانی بەدانیشتنەوە ـ بیکە ـ ئەگەر ـ بەدانیشتنەوەش ـ نەتوانی لەسەر تەنیشت ـ بیکە ـ)) .

(صحیح) (حم ، خ ، ع) لە عیمران کوڕی حوسەینەوە : ڕیوایەتیان کردووە . (صەحیحی) ابی داود ٨٧٨ ، ئیروا ٢٩٩ ، ٥٥٧.

موناوی فەرموویەتی :نوێژی فەرز بەپێوەبکە ئەگەر توانای وەستانت هەبوو ، خۆئەگەر تووشی‌نارەحەتی و ئازار بووی یان نەخۆشیەکەت زیادی کرد ، ئەوا بە دانیشتنەوە نوێژ بکە چۆنت پێ باش بوو ، ئەگەر ئەوەشت نەتوانی لەبەر ئەو هۆیانە ، ئەوا لەسەر تەنیشت ڕووەو قیبلە لەسەر لای ڕاست باشترە ، لەسەر لای چەپ باش نیە بەبێ عوزر .

٢٦١ ـ ٣٨٢٨((صَلاةُ القاعِدِ نِصْفُ صَلاةِ القائم)) .

(صحيح) (حم ، ن ، ه) عن أنس (ه) عن إبن عمر (طب) عن إبن عمر وعن عبدالله بن السائب وعن مطلب بن ابي وادعة . الروض النضير ٥٨٥ و ٧٧٦ .

## مانای فەرموودەکە

٣٨٢٨-٢٦١ ((پاداشتی نوێژی بابای دانیشتوو نیوەی پاداشتی ئە و کەسەیە کە نوێژ بەپێوە دەکا ئەگەر توانی ڕابوەستێ بەلأم ڕانەوەستا ئەوە لە حەقی ئەو کەسانەیە ، وە ئەو فەرموودەیە پێغەمبەریش (ﷺ) ناگرێتەوە چونکە ئەو پارێزراو بووە لەوەی کە تەمبەڵی بنوێنێ .

## ٥١ - فاتیحە لە نوێژدا و ئامین کردنی دوای تەواو بوونی

٢٦٢ ـ ٤٥٣٥ ((كُلُّ صَلاةٍ لايُقْرأ فيها بأمِّ الكِتابِ فَهي خِداجُ))

(صحيح) (حم ، ه) عن عائشة . (حم ، ه) عن إبن عمر و (هق) عن علي (خط) عن ابي امامة .

الروض النضير ٨٠٠ ، الطيالسي ، ابو عبيد ـ ابي هريرة .

## لێكدانەوەی هەندێك لە ووشەكان

١) ام الكتاب : مەبەست لە فاتحەیە ، بۆیە وای پێ دەوترێ چونكە سەرتای قورئانە .

٢)خداج : ناتەواو .

مانای فەرموودەكە :

٢٦٢-٤٥٣٥ ((هەموو نوێژێك كە فاتیحەی تێدا نەخوێنرێ ئەوا ئەو نوێژە ناتەواوە .

(صحیحە) (حم ، ه) لە عائیشەو (حم ، ه) لە ئیبنو عەمرو (هق) لە ڕەوخوێنە خیر (٨٠٠) ، طیالیس - ئەبو عبید - ابی هریرە .

موناوی فەرموویەتی : (كل صلاة) دەربڕینەكە گشتی‌یەو هەموو نوێژێك دەگرێتەوە فەرزبێ یاخود سوننەت بەتاك بێ یاخود بە كۆمەڵ ، لەبەر ئەوەی كەدەربڕینی (كل) بۆ گشتی‌یە . (لایقرأ فیها بأم الكتاب) مەبەست لە فاتیحەیە و بۆیەش پێی دەوترێ (ام القران) چونكە سەرەتایی قورئانە بۆ خوێندنەوە . (فهي خداج) ، ـ لە زمانی عەرەبی دا ـ دەگوترێ (خدجت الناقة) كە منداڵەكەی لەبەر چووە لەبری ناتەواوی بەكاردەهێنرێ ناتەواویەك كە بەتاڵی بكا و هەڵی وەشێنێتەوە ، وە نوێژ بێ ئەو دروست نیە بەتەنها ، بەلای‌شافعی لە جەماعەتیش دابێ دروست نیە ـ بەڵام ـ ئەبو حەنیفە فەرموویەتی : پێویست نیە لەسەر ئەو كەسانەی كە لە دوای ئیمامەوە نوێژ دەكەن ، ئیمام مالیكیش هەمان بۆچونی هەیە ، ئیمام (ئەحمد)یش لەو نوێژانەی كە بەدەنگەوە (جهری دەكرێن بە پێویستی نازانێ .

٢٦٣ ـ ١٤٠١ ((أَمِّنُوا إذا قُرِئَ (غَيرِ المَغْضوبِ عَلَيْهِمْ ولا الضَّالين)) .

(صحيح) (إبن الشاهين في ((السنة)) عن علي .

### مانای فەرموودەكە

٢٦٣ ـ ١٤٠١ ((بڵێن ئامین كاتێك كە (غیر المغضوب علیهم ولا الضالین) خوێندرا))

(صەحیحە) (ئیبن و شاهین لە (السنة) دا لە عەلی گێڕاویەتەوە .

موناوی فەرموویەتی :(أمنوا) بڵێن ئامین سوننەتە (إذا قرئ) كاتێك كە ئیمام لە نوێژدا خوێندی ، یاخود هەریەكێكیان خوێندنی بالەناو نوێژیشدا نەبێ ، كاتێك لە (ولاالضالین)ەكە بۆ وە ئەو جار بڵێن (آمین) ، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ ئیمام بەوە ڕاناگا كە تەواوی كات زۆر بەی ئەوانەی كە لە دوایەوە نوێژ دەكەن ئامینەكە دەكەن وەلە ڕیوایەتی تردا هاتووە كە فریشتەكانیش ئامین دەكەن لەگەڵ تەواو بوونی ئیمام لە (ولاالضالین)ەكە جا هەركەسێكیش لەگەڵ فریشتەكان بڵێ ئامین ئەوا خوا لە تاوانە بچوكەكانی خۆش دەبێ .

٢٦٤ ــ ٥٦١٣ ((ما حَسَدَتْكُمُ اليَهودَ علىٰ شَيءٍ ما حَسَدَتْكُم علىٰ السَّلامِ والتأمينِ)) .

(صحيح) (حم ، هـ) عن عائيشة ، صحيحالترغيب ٥١٥ .

## ماناى فەرموودەكە

٢٦٤ ــ ٥٦١٣ جوەكان ((ئێرەیی تان پێنابەن لەسەر هیچ شتێك وەك ئێرەیتان پێ دەبەن لە سەلام ــ كردن ــ و ئامین ــ كردن ــ)) .

(صەحیحە) (حم ، هـ) لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە ، صەحیحی تەرغیب ٥١٥ .

مونـاوی فەرموویەتی : ئەوە سەلامی ئەهلی بەهەشتەو ئامینیش بۆ ئەوانی پێش ئێمە نەبووە تەنها بۆ موسی و هارونی نەبێ (علیهما السلام) ، حەكیم لەنەوادیرەكانی دا باسی كردووە ، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە سەلام لە تایبەت مەندیەكانی ئەم ئۆمەتەیە .

## ٥٢ - چوونە ركوع و سوجدە و خوێندنی قنوت .

٢٦٥ ــ ١٢١ ((اتِمُّوا الرُّكوعِ والسُّجود ، فَوَ الّذي نَفْسي بِيَدِهِ إنّي لأَراكُمْ مِنْ وَراءِ ظَهْري إذا رَكَعْتُم و إذا سَجَدْتُم)) .

(صحيح) (حم ، ق ، ن) عن انس ، صفة الصلاة ص ١١ ، ومعناه في الترغيب (٢١١/١) .

## ماناى فەرموودەكە

٢٦٥ ــ ١٢١ ((بە تەواوی بچنە روكوع و سجودەوە ، دەی بەدڵنیایی‌یەوە دەتانبینێن كاتێك چوونە ركوعەوە و كاتێك سوجدەتان برد)) .

(صەحیحە) (حم ، ق ، ن) لە ئەنەسی گێڕاویانەتەوە . صیفەت وصەلات ل ١١ ، وە ماناكەی لە تەرغیبدا هاتووە (٢١١/١) .

مونـاوی فەرموویەتی : (اتموا الركوع والسجود) بە تەواوی مەرج و سوننەت و ئادابەكانی جێبەجێ بكەن وە جێگیر بوون تێیدا پێویستە (فو الذي نفسي بيده) سوێند بەو خوایەی كە گیانی منی بەدەستە مەبەستی زاتی خوایە .

(إني لراكم من وراء ظهري) من بەدڵنیاییەوە لەپاش پشتمەوە دەتان بینم كە دەچنە ركوع و كە دەچنە سجود ، دیارە ئەم شتە یەكێك بوو لە موعجیزەكانی پێغەمبەر (ﷺ) وە زانایان بۆچوونیان جیاوازە لەسەر چۆنیەتەكەی لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان گەردنم كەچن بۆ ئەم دینە ، ئیبن حەجەر فەرموویەتی : (ئەو فەرموودەیە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە كە ئەو بینینە تایبەتە بە حاڵەتی نوێژ و بەڵگە نیە لەسەر بینین لەهەموو كاتێكدا .

٢٦٦ ـ ٤٧٣٢ ((كانَ إذا رَكَعْ سَوّىٰ ظَهْرَهُ حَتّىٰ لَوْ صُبَّ عَلَيهِ الماءُ لاسْتَقَرّ)) .

(صحيح) (ه) عن وابضة ، (طب) عن إبن عباس وعن أبي برزة وعن أبي مسعود الروض النضير ٧٨ ، صفةالصلاة ل ٥١١ عنهم ، طس .

## مانای فەرموودەکە

٢٦٦ ـ ٤٧٣٢ ((کاتێك دەچووە ڕکوع پشتی ڕێك دەکرد هاتا ئاوت لەسەر ڕشتبایە ڕادەوەستاوە ـ جێگیر دەبوو)) .

(صحيح) (ه) وابضە (طب) لەئیبنو عەباس و ئەبی بەرزەو لە ئەبی مەسعودەوە گێڕاویانەتەوە . ڕەوضو النضير ٧٨ ، صيفة الصلاة ل ١١ ، عم طس .

<u>موناوی فەرموویەتی</u> : ئەوە دەلیلە بۆ ئەوەی هەرسێ پێشەواکان (مالك ، شافعي ، أحمد) ووتویانە سەبارەت بەڕکوع .

٢٦٧ ـ ٤٧٣٣ ((كانَ إذا رَكَعَ فَرَّجَ أَصابِعَهُ وإذا سَجَدَ ضَمَّ أصابِعَهُ)) .

(صحيح) (ك ، هق) عن وائل بن حجر . صفة الصلاة ١١٠ ، ١٢٣ ، صحيح ابي داود ٨٠٩ : الطياليسي .

## مانای فەرموودەکە

٢٦٧ ـ ٤٧٣٣ ((کاتێك چووبایە ڕکوعەوە پەنجەکانی ـ دەستی لێك ـ بڵاو دەکرد ، کە چووبایە سوجدەوە پەنجەکانی ـ دەستی ـ بۆ لاییەك دەهێنایەوە ـ بەیەکەوەی دەنوساند ـ)) .

(صەحیحە) (ك ، ه) لەواثیلی إبن حەجەرەوە گێڕاویانەتەوە .صیفەت و صەلات ل ١١٠ ، ١٢٣ ، صەحیحی ئەبی داود ٨٠٩ : الطياليسي .

<u>موناوی فەرموویەتی</u> : بەشێوەیەکی مام ناوەندی پەنجەکانی لەڕکوع دا لێك بڵاو دەکرد ، وە قورطوبی فەرموویەتی : حیکمەتی سوننەتی پەنجە بەیەکەوە نوساند لە سوجود دا خۆ یەکەم گرتنی تێدا بەدی دەکرێ .

٢٦٨ __ ٤٦٣٣((كانَ إذا رَكَعَ قال : سُبْحانَ ربيَ العَظيم وَبِحَمدِهِ ثَلاثاً ، وإذا سَجَدَ قالَ : سُبْحانَ ربِّيَ الأَعلىٰ وبِحَمْدِهِ ثَلاثاً)) .

(صحيح) (د) عن عيبة بن عامر . صفة الصلاة ، ص١١٣ .

## ماناى فەرموودەكە

٢٦٨ __ ٤٧٣٣((كاتێك كە دەچووە ڕكوعەوە دەى فەرموو : (سبحان رَبي العظيم وبحمده) سىٰ جاران ، وەكاتێك كە دەچوە سووجدەوە دەيفەرموو: (سبحان ربي الاعلي وبحمده) سىٰ جاران)) .

(صەحيحە) (د) لە عوقبەی كوڕی عامر گێڕاويەتيەوە .صەيفەت و صەلات ، ل ١١٣ .

موناوى فەرموويەتى : لەڕكوعەكەی دەيفەرموو : (سبحان ربي العظيم) واتە : (وبحمده) بەتەوفيقی ئەو نەك بەهەوڵ و كۆششی خۆم .

هەركام لەڕكوع و سجودە لالەت لەخۆم بەكەم زانين و گەردن كەچی دەكەن ، وە ئوممەتانی تريش فەرمانيان پێكراوە كە ڕكوع و سجود بەرن.

٢٦٩-٤٦٥٥- ((كان اذا ارادَ ان يَدعُوَ على احَدٍ او يَدْعو لأَحَدٍ قَنَتَ بَعْدَ الرُّكوعِ)) (صحيح (خ) عن ابى هريره .

## ماناى فەرموودەكە

٢٦٩ __ ٤٦٥٥((كاتێك كەويستبای دوعا لەسەر يەكێ بكا يان دوعا بۆيەكێ بكا لەدوای ڕكوع قونوتی دەخوێند)) .

(صەحيحە) (خ) لە ئەبو هورويرەوە گێڕاويەتيەوە .

موناوى فەرموويەتى : ئەگەر وويستبای توك لەيەكێ بكا لەنوێژ دا توكی لێ دەكرد لە خوا دەپاڕايەوە كە تۆڵەی لێ بسێنێ ، وە ئەگەر ويستبای دوعای بەخێر بۆ يەكێ بكا ، دوای ڕكوع قونوتی دەخوێند .

٢٧٠ __ ٥٩٥((إذا سَجَدَ أحَدُكم فَلا يَبْرُكْ كَما يَبْرُكَ البَعير ، وَلْيَضَعْ يَدَيهِ قبل رَكْبَتَيهِ)) .

(صحيح) (د ،ن) عن ابي هريرة . المشكاة ٨٩٩٠ ، الارواء ٣٥٧ ، صفة الصلاة ١٢٢ ، حم .

## لێكدانەوەی هەندێك لە ووشەكان

فلا يبرك : بادانەنيشێ .

## مانای فەرموودەکە

٢٧٠ ــ ٥٩٥ ((کاتێك هەریەکێکتان سوجدەی برد ، با دانەنیشێ وەکو ووشتر ، وە دەستەکانی دابنێ پێش ئەژنۆکانی)) .

(صەحیحە) (د ، ن) لە ئەبی هورەیرەوە . میشکات ٨٩٩٠ ، ئیرواء ٣٤٧ ، صیفەت صەلات ١٢٢ : حم.

موناوی فەرموویەتی :با ئەژنۆکانی دانەنێ پێش دەستەکانی وەکو وشتر کە بەر لە دەستەکانی ئەژنۆکانی لە زەوی دادەنێ لە کاتی دانیشتندا ، لەبەر ئەوە ئەمە زیاتر زەلیلی و گەردن کەچی پێوە دیارە ، خوا بەگەورە گرتنی زیاتر تێدا بەدی دەکرێ .

٢٧١ ــ ١١٧٤ ــ ٥٣٥((أقْرَبُ مايَكونُ العَبدُ مِنْ ربِّهِ وهو ساجِدٌ ، فَأكثِروا الدُّعاء)) .

(صحيح) (م ، د ، ن) عن ابي هريرة . صحيح ابي داود ٨١٩ ، الارواء ٤٥٦ : حم ، أبوعوان ، هق .

## مانای فەرموودەکە

٢٧١ ــ ١١٧٥ ــ ٥٣٥((نزیکترین کاتی بەندە لەپەروەردگاری ــ ئەو کاتەیە ــ کە ئەو لەکڕنۆش دایە ، جا زۆر دوعای تێدا بکەن)) .

(صەحیحە) (م ، د ، ن) لە ئەبی هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە . صەحیحی ئەبی داود ٨١٩ ، ئیرواو ٤٥٦ ، حم ، ئەبو عەووانە ، هق.

٢٧٢ ــ ١٣٦٩((امرتُ ان اسْجُدَ علىٰ سَبْعةِ أعظُم : علىٰ الجَبْهةِ ،واليَدَينِ ، والرُكْبَتَينِ ، وأطرافِ القَدَمَين ، ولانكفتُ الثِّيابِ والشَّعرِ)) .

(صحيح) (ق ، و ، ن ، ه) عن إبن عباس .روض ٣٩٨ ، صحيح ابي داود ٨٢٩ ، الارواء ٣١٠.

## لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

نكفت : کۆ کردنەوە ، خڕ کردنەوە .

## مانای فەرموودەکە

٢٧٢ ــ ١٣٦٩((فەرمانم پێکراوە کە سوجدە بەرم لەسەر حەوت ئێسکان ، لەسەر ناوچەوان ــ تەوێڵ ــ وە هەردوو لەپی دەست ، وە هەردوو ئەژنۆ ، وە پەنجەکانی هەردوو پێ ، وە پۆشاکمان هەڵنەکەین و خڕنەکەینەوە و قژمان خڕنەکەینەوە نەسیبەستین ــ لەکاتی نوێژ کردندا ــ)) .

(صەحیحە) (ق ، و ، ن ، ه) لە ئیبن عەباسەوە گێڕاویەتیەوە . ڕەوض ٣٩٨ ، صەحیحی ئەبی داود ٨٢٩ ، ئیرواء ٣١٠ .

موناوی فەرموویەتی : بۆیە بەستن و خڕ کردنی قژ نەهی لێ کراوە چونکە شەیتان لەسەری دا دەنیشێ لەنوێژدا .

٢٧٣ __ ٥٩٨((إذا سَجَدْتَ فَضَعْ كَفيكَ ، وارفَعْ مِرْفَقَيك)) .

(صحيح) (حم ، م) عن البراء ، صفة الصلاة ١٢٢ : ابو عوانه .

## مانای فەرموودەکە

٢٧٣ __ ٥٩٨((کاتێك کە سوجدەت برد لەپی دەستەکانت دابنێ وە ئانیشکەکانت بەرزکەوە)) .

(صەحیحە) (حم ،م) صیفەت والصلات : ابو عەوانە .

موناوی فەرموویەتی : خۆ بەکەم زانینی پێوە دیارە ، بەرزکردنەوەی ئانیشکەکان ... دیاردەی تەمبەڵی و تەوەزەلی .

٢٧٤ __ ٦٨٦٤((نهىٰ عَنِ الإقعاءِ في الصَّلاة)) .

(صحيح) (ك ، هق) عن سمرة . الصحيحة ١٦٧٠ : حم انس .

## لێکدانەوەی هەندێك لەووشەکان

الإقعاء : وەرکەوتن ، نوساندنی سمتەکان بە زەوی وەجێگیر کردنی لولاك و دانانی دەستەکان لەسەر زەوی .

## مانای فەرموودەکە

٢٧٤ __ ٦٨٦٤((قەدەغەی کردووە لە وەرکەوتن لەنوێژدا)) .

(صەحیحە) (ك هق) لە سەمرەوە گێڕاویانەتەوە .

صەحیحە (١٦٧٠ : حم لە ئەنەسەوە گێڕاویەتیەوە) .

موناوی فەرموویەتی :

(إلاقعاء) دووجۆرە : یەکێکیان ئەوەیە کە نەهی لێ کراوە ، دووەمیان ، ڕاستەو تەواوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینراوە کە سەرە پەنجەکانی هەردوو پێی و ئەژنۆکانی لەسەر زەوی داناوە ، وەسمتەکانیشی لەسەر پاژنەی پێکانی داناوە ، ئەمەش سوونەتە لە دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەکان.

٢٧٥ __ ٧٢٢٥((لاتُجزئ صَلاةً لايُقيمُ الرَّجُلُ فِيها صُلْبَهُ في الرُّكوعِ والسُّجودِ)) .

(صحيح) (حم ، ن ، ه) عن ابي مسعود .مشكاة ٨٧٨ ، صحيح ابي داود ٨٠٦ .

## مانای فەرموودەکە

٢٧٥ __ ٧٢٢٥((پاداشتی نوێژێك نادرێتەوە کە پیاو __ وئافرەت __ پشتی تێیدا ڕاست _ ڕێك _ نەکا لە ڕکوع و سجوددا)) .

(صەحیحە) (حم ، ن ، ه) لە ئەبی مەسعودەوە گێڕاویانەتەوە . میشکات ٨٧٨ ، صەحیحی ئەبی داود ٨٠٦ .

موناوی فەرموویەتی : نوێژێك دروست نیە پشتی تێدا ڕێك نەكرێ ، مەبەست لە جێگیر بوون و لە جوولە كەوتنی ئەندامەكانە ، كە ئەمەلای ئیمامی شافعی و ئیمام ئەحمەد واجبە .

## ٥٣ _ دانیشتن و تەحیات خوێندن و سەلام دانەوە

٢٧٦ _ ٦٤٨((إذا صَلّى أحَدُكُم فليَبْدأ بتَحْميدِ اللهِ تَعالىٰ والثناءِ عَلَيهِ ، ثم ليُصلّ علىٰ النبي (ﷺ) ثم ليدعُ بَعدُ بِمٰاشاءَ)) .

(صحيح) د ، ت ، حب ، ك ، هق) عن فضالة بن عبيد . صفة الصلاة ٧٢ ، صحيح أبي داود ١٣٣١ : حم ، ن .

## لێكدانەوەی هەندێك لە ووشەكان

١) بتحميد الله : بە سوپاس كردنی خوا ، وشە (حمدالله) سوپاس كردنی خوایە بەهۆی سیفەتە تەواوەكانیەوە ، وە بەهۆی كارەكانیەوە كە لە نێوان چاكەو دادوەری خۆ یدایە .

٢) الثناء : سوپاس لەدوای سوپاس .

## مانای فەرموودەكە

٢٧٦ _ ٦٤٨((كاتێك هەریەكێكتان نوێژی كرد بابەسوپاسی خوا دەست پێ بكات و ستایشی بكات ، وە پاشان صەلاوات لەسەر پێغەمبەر دا (ﷺ) _ و پاشان _ لەدوای صەلاوات _ با دوعا بكا بەوەی كە دەیەوێ)) .

(صەحیحە) (د ، ت ، حب ، ك ، هق) لە فوچالەی بنی عوبەیدەوە گێڕاویانەتەوە .

صیفەت و صەلات ٧٢ ، صەحیحی ئەبی داود ٣١٣١ : حم ، ن .

موناوی فەرموویەتی : هەندێك وتویانە لێرەدا مەبەستی لە (حمد) دەستپێ كردنە تەشەهودە (تەحیاتە) ، وەپاشان (ليدع) بابپاڕێتەوە (بعد) دوای ئەوە كە باسكرا (بما شاء) بەهەرچی دەیەوێ لەدین و یاخود دنیادا .

لەبنەڕەتدا ئەو فەرموودەیە سەبارەت بەپیاوێك وتراوە كە دەپاڕایەوە لە نوێژەكەی داو سوپاسی خوای تێدا نەدەكردوو صەلاواتی لەسەر پێغەمبەر نەدەدا (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ)

پاشان بانگی كرد فەرمووی (إذا صلى أحدكم ...) ، ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە پەلە كردن پەسەند نیە لە نوێژدا ، وە پێویستیەتی (تەشە هودی) كۆتایی دەگەیەنێ لەگەڵ دانیشتن بۆی و صەلاوات دان لە پێغەمبەر (ﷺ) وە فێر كردنی نەزانینیشی تێدایە .

٢٧٧ __ ٤٢ ٤٢٦٤((فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ التَّحِيَّةُ))

(صحيح) (م) عن عائشة .صحيح ابي داود ٧٥٢ ، حم ، د ، ق ، الطيالسي .

## مانای فەرموودەكە

٢٧٧ __ ٤٢٦٤((لە هەموو دوو ڕكاتێكدا تەحيات هەيە)) .

(صەحيحە) (م) لە عائيشە گێڕاويەتيەوە . صەحيحی ئەبی داود ٧٥٢ : حم د ، ق ، الطيالسي .

موناوی فەرموويەتی :ئەمە بەڵگەيە لەسەر ئەوەی كە ئيمامی ئەحمەد وتويەتی سەبارەت بە پێويست بوونی تەشەهودی يەكەم لای ئيمام ئەحمەد وەكو تەشەهودی كۆتايی وايە ، بەڵام ئيمام شافيعی وتويەتی : يەكەميان سوننەتە بەڵام دووەميان پێويستە ئيمام ماليك و ئەبو حەنيفەش وايان ووتوە .

٢٧٨ __ ٦٨٢٢((نَهىٰ ان يَجلِسَ الرَّجُلُ فِي الصَّلاةِ وهُوَ مُعتمدُ علىٰ يَدِهِ اليُسرىٰ وقال : إنها صلاةُ اليَهود)) .

(صحيح) (ن ، هق) عن إبن عمر .المشكاة ٩١٤ ، الإرواء ٣٨٠ .

## مانای فەرموودەكە

٢٧٨ __ ٦٨٢٢((قەدەغەی كردووە كەكەسێك لەنوێژدا دابنيشێ و _ ئەو _ كەسە _ لەسەر دەستی چەپی پاڵداتەوە وە فەرموويەتی : ئەمە نوێژی جوەكانە)) .

(صەحيحە) (ن ، هق) لە ئيبن عومەرەوە گێڕاويانەتەوە . ميشكات ٩١٤ ، ئيرواء ٣٨٠ .

موناوی فەرموويەتی : فەرمانمان پێ كراوە كە پێچەوانەی ئەوان _ جوەكان_ بجوڵێنەوە ، ئيبنو تەيميە فەرموويەتی ، ئەو فەرموودەيە ئاگادارمان دەكاتەوە لەوەی كە هەرچی هاوبەشی پەرستان دەييكەن لە بواری پەرستن و ئەو بابەتانە كە دەبێتە مايەی سەرپێچی كردن بەنيەت ، پێغەمبەر (ﷺ) _ نەهی كردووە لە موسوڵمانان كەلە ڕووكاريشدا بيكەن ، ئەگەر مەبەستيشيان وەك مەبەستی بێ باوەڕان نەبێ بۆ يەكلابونەوە و جيابوونەوە لەگەڵياندا .

٢٧٩ __ ٤٩٨٩((كان يعقِدُ التَّسبيحَ)) .

(صحيح) (ت ، ن ، ك) عن إبن عمر . الضعيفة ١١٢١ ، حب .

## مانای فەرموودەكە

٢٧٩ _ ٤٩٨٩((پێغەمبەر (ﷺ) _ خوای بە پاك دەگرت و يادی دەكرد _ بەدەستی ڕاستی )) .

ئەلبانی فەرموويەتی : بەدەستی ڕاستی يادی خوای دە كرد ، وەكو لە ڕيوايەتی ئەبی داود هاتووە ، وە لە ڕيوايەتی تردا هاتووە كە بەسەرە پەنجەكانی دەستی ڕاستی يادی خوای دەكرد.

ئیبن باز فەرموویەتی : (دەربارەی حوکمە یادی خوا کردن بەتەسبیح) ، ولزلێهێنانی چاکترە ، هەندێك لە ئەهلی علیم بێزاندویانە ، چاکتر وایە بە پەنجەکانی دەست بکرێن .
ـ لەو بارەیەوە ئەلبانی دەفەرمووێ :
ئەگەر تەسبیح تەنها ئەو خەراپەی هەباکە سوننەتی یاد کردن بەپەنجەکان دەمرێنێ بەس بووە بۆ واز لێهێنانی .

## ٥٤ ـ ئەو کارانەی کە رێیان پێدراوە و ئەوانەش کە قەدەغەن لەنوێژدا .

**٢٨٠ ـ ٤٧٢ ـ ١٧٦((إذا تثـاءب أحَدُكُـم في الصَّـلاة فليُكظِـمْ ماأستطاعَ فإن الشيطان يَدْخلُ)) .**

(صحيح) (م ، د) عن ابي سعيد مختصر مسلم ٣٤٥ ، الضعيفة ٢٤٢٠ .

### لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەكان

١) تثـاءب : باوێشکی دا .
٢) فليكظم : بابیگرێ .

### مانای فەرموودەكە

٢٨٠ ـ ٤٧٢ ـ ١٧٦((ئەگەر ـ کاتێك ـ یەکێکیان لەنوێژدا باوێشکی هات بابیگرێت ئەوەندەی کە دەتوانێت ، ـ چونکە ـ بەدڵنیاییەوە شەیتان دەچێتە ناو ـ دەمیەوە کاتێك دەمی ئاوەڵە بکاتەوە ـ)) .

(صەحیحە) (م ،د) لە ئەبی سعید گێراویانەتەوە .موختەصەری موسلیم ٣٤٥ ، ضەعیفە ٢٤٢٠ .

موناوی فەرموویەتی : ئەوەی لێی وەردەگیرێ کە مرۆڤ لە زۆر خواردن کەم بکاتەو ، چونکە زۆر خواردن دەبێتە مایەی باوێشك هاتن ، وەلەرپوایەتی تردا هاتووە کە شەیتان پێی پێ دەکەنێ و دڵخۆش دەبێ .

**٢٨١ ـ ٤٧٨ ـ ٢١٩((إذا حَضَر احَدُكُم الأَمرُ يَخْشىٰ فَوْتَهُ فَليُصَلِّ هذهِ الصلاة يعني الجَمعُ بَينَ الصَّلاتَين)) .**

(حسن) (ن) عن إبن عمر الصحيحة ١٣٧٠ ، طب .

### مانای فەرموودەكە

٢٨١ ـ ٤٧٨ ـ ٢١٩((کاتێك کە یەکێکتان کارێکی هاتە ـ پێش و دەترسا لەوەی کەلەکیسی ـ لەدەستی ـ بچێ با ئەم نوێژە بکا ، مانای کۆکردنەوە لەنێوان دوو نوێژ)) .

(حەسەن) (ن) لە ئیبن و عومەر گێراویەتیەوە . الصحیحە ١٣٧٠ ، طب .

نەوەوی لە شەرحی موسلیمدا فەرموویەتی : کۆمەڵێك لە پێشەوایان فەرموویانە کە کۆکردنەوەی نوێژ رێی پێدراوە بۆ کاتی پێویستی ، وە ئیبن و تەیمیە ـ رەحمەتی خوای

لێ بێت ـ فەرموویەتی : فراوانترین مەزهەب لە کۆ ـ کردنەوەدا مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدە ، وەئەو ڕێی داوە بە کۆکردنەوەی لە کاتی سەر قاڵی دا ، وە نەسائی فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێی دواە بە نانەواو چێشت لێنەر کە نوێژ کۆبکەنەوە گەر لەماڵەکەیان بترسن .

هەروەها لەکاتی نەخۆشی و ترس و باران بارین دارێی پیێ دراوە .

٢٨٢ _ ٦٥٣((إذا صلىَّ أحَدُكم فليلبِسْ نَعْلَيه أو ليخلَعْهُما بَيْنَ رِجْلَيه ولا يؤْذ بِهِما غيرَه)) .

(صەحيحە) (ك) عن ابي هريرة ، صفة الصلاة ٦١ ، صحيح ابي داود ٦٦٢ .

## مانای فەرموودەکە

٢٨٢-٦٥٣ ((کاتێك کە هەریەکێکیان نوێژی کرد با نەعلەکانی لەپێکا ، یاخود با لەنێوان قاچەکانیدا دایان بنێ وەبا کەسیان پێ ئازار نەدا)) (صەحیحە) (ن) لە ئەبی هورەیرەوە گێڕاویەتەوە .

صیفتوصەلات (٦١) ، صەحیحی ئەبی داود (٦٦٢) .

موناوی فەرموویەی :کاتێك کە هەریەکێکتان ویستی نوێژ بکات پێیانەوە _ واتە نەعلەکانەوە _ با نوێژیان پێوە بکا ، _ ئەمە ڕەئیە _ لەلای جمهور _ ی عولەمایان _ بەمەرجێك پیسیان پێوە نەبێ ، (إبن دقيق العيد) فەرموویەتی ئەمە سوننەت نیە بەڵکو تەنها بوارێکەو ڕێی پێ دراوە ، هەندێك لەسەلەف ڕەحمەتی خوایان لێ بێ فەرموویانە ، پێڵاوی پیس بەخشاندن لە زەوی پاك دەبێتەوە و نوێژی پێوە دروستە ، ووتەی کۆنی ئیمام شافعیش _ ڕەحمەتی خوای لێ بێت _ هەمان شتە .

٢٨٣ _ ٦٤٤ _ ٢٩٠((إذا صَلَّى أحَدُكُم فَلا يَبصَقْ بَينَ يَدَيهِ ولا عَنْ يَمينِهِ وليبصِق عَنْ يَسارِهِ ، أوتحتَ قدمِه)) .

(صحيح) (حم ، حب) عن جابر ، (ن) عن ابي هريرة . صحيح ابي داود ٤٩٧ ، عن طارق .

## مانای فەرموودەکە

٢٨٣ _ ٦٤٤ _ ٢٩٠((کاتێك کە هەریەکێکتان نوێژی کرد با لە نێوان هەردوو دەستی _ لەبەردەمی _ تف ڕۆ نەکا ، وەنەلەلای ڕاستی ، وە بالەلای چەپی تف ڕۆبکا ، یاخود لە ژێر پێی)) .

(صەحیحە) (حم ، حب) لە جابر ، (ن) لە ئەبی هورەیرە گێڕاویانەتەوە .

صەحیحی ئەبی داود لە طاریقەوە .

٢٨٤ _ ١٣٤٠((اما يَخْشىٰ أحدُكُم إذا رَفَعَ راسَهُ في الصَّلاةِ ان لايَرجِع إليهِ بَصَرُهُ ؟)) .

(صحيح) (حم ، م ، هـ) عن جابر بن سمرة .

## مانای فەرموودەكە

٢٨٤ _ ١٣٤٠((ئایا هەریەكێكتان ناترسێ كاتێك كە سەری بەرز بكاتەوە لە نوێژدا كە چاوی بۆ نەگەڕێتەوە)) .

(صەحیحە) (حم ، م ، هـ) لە جابری كوڕی سەمورە وە گێڕاویانەتەوە .

موناوی فەرموویەتی : هۆی ئەوانەی نوێژ دەكەن ، كاتێك كە هەر یەكێكیان لە ڕكوع دا یاخود لە سجودی نوێژدا بەر لە ئیمام سەر بەرزبكاتەوە ، ناترسێ لەوەی كوێر بێ بەر لەوەی سەر بەرز بكاتەوە ، پاشان چاوەكانی بۆ نەگەڕێتەوە دوای ئەمە ، وەئەمە هەڕەشەیەكی ترە ، ئەوەی تێدا بەدی دەكرێ كە نابێ كەس بەر لە ئیمام لە نوێژی بە كۆمەڵدا سەر بەرز بكاتەوە نەلە ڕكوع نەلە سجود دا .

٢٨٥ _ ٢٢٦٥((إن هذهِ صَلاةٌ لايَصْلِحُ فيها شَيْءٌ مِنْ كَلامِ النّاسِ ، إنّما هو التَّسبيح والتَّكبير و قِرَاءَةُ القُرآنِ)) .

(صحيح) (حم ، م ، د ، ن) عن معاوية بن الحكم . صحيح ابي داود ٢٨٦٢ ،الإرواء ٣٩٠ ، مختصر مسلم ٣٢٣ .

## مانای فەرموودەكە

٢٨٥ _ ٢٢٦٥ _ ١٠١٧((بەدڵنیاییەوە ئەمە نوێژێكە چاك نیە تێیدا شتێك لە قسەی خەڵكی ، بەڵكو تەنها _خوا _ بەپاك گرتن و _ خوا _ بەگەورە گرتن و قورئان خوێندنە)) .

(صەحیحە) (حم ، م ، د ، ن) لە موعاویەی بنی حەكەمەوە گێڕاویانەتەوە . صەحیحی ابی داودی ٨٦٢ ، ئیرواء ٣٩٠ ، موختەصەری مسلم ٣٢٣ .

٢٨٦ _ ٣٢١٠((خالِفوا اليَهودَ فإنهُم لايُصَلونَ في نِعالِهِم ولاخِفافِهِم)) .

(صحيح) (د ، ك ، هق) عن شداد بن أوس المشكاة ٧٦٥ .

## مانای فەرموودەكە

٢٨٦ _ ٣٢١٠((بەپێچەوانەی یەهود (جوەكان) بكەن ئەوان نوێژن ناكەن بەنەعلەكانیانەوە ، وەنەبەخوفەكانیانەوەش .

(صەحیە) (د ، ك ، هق) لەشەددادی بنی ئەوسەوە گێڕاویانەتەوە . میشكات ٧٦٥

موناوی فەرموویەتی : نوێژیان پێوە بكەن گەر پاكین ، وە لەشەرعی موسادا (علیە صلاة والسلام) دەبوو بەبێ پێڵاو بێ خوف نوێژ بكەن _ خوای گەورە بەرامبەر موسا دەفەرموێ : _ (اخلع نعليك) _ واتە _ نەعلەكانت دابنێ ، (العراقی) فەرموویەتی :

حیکمەتی نوێژ کردن بەپێڵاوو نەعل و خوفەوە ئەوەیە پێچەوانەی ئەهلی کیتابەو لەبەر مەترسی ئەزیەت دانی خەڵك ئەگەر دایانبکەنێ _ دایانبنێ _ وەئەگەر پێیانەوە بکا لە دزیش جارێکیان پێڵاوەکانم دانا لە کاتی نوێژدا سەگێك هاتوو بردی ، هێنانی و بردنی پیسی کردن . وە ئیبن و حەجەریش فەرموویەتی : ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر سوننەتیەتی نوێژ کردن بە پێڵاوەوە .

٢٨٧ _ ٢٩٦٤((كانَ يُصَلّي علىٰ بساط)) .

(صحيح) (هـ) عن إبن عباس .صحيح ابي داود ٦٦٥ ، إبن خذيمة ، الضياء ، حم ، ق ، د ، انس .

## مانای فەرموودەکە

٢٨٧ _ ٤٩٦٤((لەسەر بەڕە _ ڕایەخ _ نوێژی دەکرد)) .

(صەحیحە) (هـ) لە ئیبن و عەبباس گێڕاویەیتەوە، صەحیحی ئەبی داودە ٦٦٥ ئیبنو خوزەیمە ، حم ، ق ، د ، ئەنەس .

موناوی فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا لەسەر حەسیر نوێژی کردووە هەر وکو لە شەرحی ئەبی دواودا هاتووە .

(ابن القیم) : فەرموویەتی پێغەمبەر خوا لەسەر زەوی سوجدەی بردووە ، وە لەسەر پێستەی خۆشکراو سوجدەی بردووە .

٢٨٨ _ ٥٤٨١((لَيَنْتَهِيَنَّ أقوامٌ يَرْفَعُونَ أبصارَهُم إلىٰ السَّماءِ في الصَّلاةِ أو لا تَرجِعُ إليهِم أبصارَهُم)) .

(صەحیح) (حم ، م ، د ، هـ) عن جابر بن سمرة . صحيح ابي داود ٨٤٦ ، صحيح الترغيب : ٥٥٢ الدارمي ، حب.

## مانای فەرموودەکە

٢٨٨ _ ٥٤٨١((سوێند بە خوا یا وازدێنن ئەو کەسانەی کە چاویان بۆ ئاسمان بەرزدەکەنەوە لە نوێژدا یان چاوەکانیان ناگەڕێتەوە بۆیان)) .

(صەحیحە) (حم ، م ، د ، هـ) لە جابری بنی سەمورە گێڕاویانەتەوە . صەحیحی ئبی داود ٨٤٦ ، صەحیحی تەرغیب : ٥٥٢ ، الدارمی ، حب .

موناوی فەرموویەتی : بێجگە لە مانای دانانی دەستەکان لەسەر کەلەکەکان بەمانای کورت هەڵێنان لە خوێندنی سورەتێك یان هەندێکی یان بەخێرایی تێك پەڕاندنی نوێژە کە بەشێوەیەك ڕکوع و سجودی تەواو نەبێ و ئەندامەکانی تێدا جێگیر نەبێ لێکدراوەتەوە ، غەزالی فەرموویەتی : هی یەکەمیان ڕاستە ، چونکە ئەم جۆرە کارە لەکاری یەهودە یان خۆ بەزل زانان و ئیسراحەتی دۆزەخیانە .

٢٩١ _ ٧٠٤٧ _ ٢٣٧٨((هُوَ إختِلاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيطانُ مِنْ صَلاةِ العَبْدِ)) .(يعني الإلتفاتِ) .

(صحيح) (حم ، خ ، د ، ن) عن عائيشة . صحيح ابي داود ٢٨٤٤ ، الإرواء ٣٧٠ .

## لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

١) اختلاس : فڕاندن ، بردنی شتێکە بە پەلە و لەکاتی بێ ئاگایدا .

٢) الإلتفات : ئاوڕدانەوە .

## مانای فەرموودەکە

٢٩١ _ ٧٠٤٧ _ ٢٣٧٨((ئەوە فڕاندنێکە _ دزیەکە _ شەیتان لەنوێژی بەندەی دەیفڕێنێ _ دەیدزێ _)) (مەبەست لە ئاوڕدانەوەیە) .

(صەحیحە) (حم ، خ ، د ، ن) لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە . صەحیحی ئەبی داود ٨٤٤ ، ئیرواء ٣٧٠ .

الطیبی فەرموویەتی :بۆیە پێی دەوترێ (اختلاس) چونکە نوێژکەر ڕوو لە خوا دەکاو شەیتانیش لە بۆسەدایە بۆ ئەوەی لەکیسی بدا ئەوەی کە دەستی دەکەوێ .

٢٩٢ _ ٧٣٥٠((لاتُصَلّوا صَلاةً في يَومٍ مَرَّتَينِ)) .

(صحيح) (حم ، د) عن إبن عمر صحيح ابي داود ٥٩٢ ، المشكاة ١١٥٧ .

## مانای فەرموودەکە

٢٩٢ _ ٧٣٥٠((نوێژێك مەکەن لە ڕۆژێکدا دوو جاران)) .

(صەحیحە) (حم ،د) لە ئیبنو عومەرەوە گێڕاویانەتەوە . (صەحیحی) ئەبی داود ٥٩٢ ، میشکات ١١٥٧ .

موناوی فەرموویەتی : (لاتصلوا صلاة) لە ڕیوایەتی ئەحمەددا بە(لاتصلی صلاة) وە لەڕیوایەتی تردا بە (لاتعاد صلاة) _ هاتوە _ بەواتا دووبارە ناکرێتەوە نوێژێك (فی یوم مرتین) لە ڕۆژێکدا دووجار ، واتە ئەوە مەکەن وابزانن کە ئەوە پێویستە ، وە فەرزەکانی دووبارە مەکەنەوە کە ناوتەواویەکی تێدا بەدی بکرێ ، بەڵام ئەو کەسەی کە بەتاکەوە نوێژ دەکا بۆی هەیە لەگەڵ جەماعەتدا دووبارەی بکاتەوە بگرە ئەمە سوننەتیشە لەتێکڕای نوێژەکاندا لای شافعی هەتا مەغریبیش ، وە پێغەمبەر(ﷺ) بەمە فەرمانی کردووە ، وە لەڕیوایەتی بوخاری موسلیمدا هاتووە .

٢٩٣ _ ٦٨٨٣((نَهَىٰ عن السَّدْلِ في الصَّلاةِ ، وأنْ يُغَطِّي الرَّجُل فاهُ)) .

(صحيح) (حم ، ع ،ك) عن أبي هريرة .المشكاة ٧٦٤ ، ، صحيح ابي داود ٦٥٠ .

## لێکدانەوەی هەندێك لە ووشەکان

السدل : بەسەرددانی چاکەت یان پاڵتۆیە بەسەر شاندا بێ ئەوەی دەست قۆڵەکانیەوە دەربهێنێ .

## مانای فەرموودەکە

٢٩٣ _ ٦٨٨٣((قەدەغەی کردووە لەوەی کە پۆشاك بەسەر شاندا بدرێ لە نوێژدا ، وەلەوەش کەکەسێك دامامك بکا ، دەمی دابپۆشێ لەنوێژدا)) .

(صەحیحە) (حم ، ع ،ك) لە ئەبی هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە . میشکات ٧٦٤ ، صەحیحی ئەبی داود ٦٥٠.

دەرباوی فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کردووە لەبەر دانەوەی پۆشاك هەتا دەکەوێتە سەر زەوی وە تایبەتی کردووە بەنوێژ لەگەڵ ئەوەشدا بەگشتی لە هەموو کاتێکدا قەدەغەی کراوە ، لەبەر ئەوەی نیشانەی خۆ بەزل زانینە ، وەلە نوێژدا ناشرین ترە ، یاخود پۆشاکێك لەبەر بکا ، دەستی دەر نەکاو _ دەرنەهێنێ _ و نوێژی پێوە بکات و نەتوانێ ڕکوعی یان سجود بەرێ ، ئەمە لە ڕەوشتی یەهودە و یەهود بەم شێوەیە نوێژیان کردووە ، یان مەبەستی لە (سدل) بەردانەوەی قژە لەوانەیە بێتەسەر نێو چاوان و ڕوو دابپۆشێ . عێراقی فەرموویەتی : (وان یغطي خاه) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەمامك کردن لە نوێژدا لەکاری نەفامیە ، لە وانەیە ببێتە ڕێگر لە قورئان خوێندن بەشێوەیەکی تێرو تەسەل .

**٢٩٤ _ ٧٤٥٢ _ ٢٦٢٧((لاتَمْسَحْ وانْتَ تُصَلّي ، فإنْ كُنْتَ لابُدَّ فاعِلاً فواحِدةً)) {يعني تسوية الحصىٰ} .**

(حسن) عن معقيب صحيح ابي داود ٨٧٢ .

## مانای فەرموودەکە

٢٩٤ _ ٧٤٥٢ _ ٢٦٢٧((مەیماڵە وەکە تۆ نوێژ دەکەی ، وە ئەگەر هەر دیکەی یەك جار بیماڵە)) (مانای ڕێکدرنی وردە بەردی بەردەم و ڕاماڵین و لابردنیان) .

(حەسەن) لەموعەیقیبی صەحیحی ئەبی داود ٨٧٢ .

**٢٩٥ _ ٧٤٧٨((لاتوصِل صلاةً بِصَلاةٍ حَتّىٰ تَتَكلَّم او تَخْرج)) .**

(صحيح) (حم ،د) عن معاوية ،صحيح ابي داود ١٠٣٤ ، الارواء ٤٤٤ : م .

## مانای فەرموودەکە

٢٩٥ _ ٧٤٧٨((نوێژ بەنوێژەوە مەنووسێنە _ مەبەستە _ تا قسە نەکەی یـ خوـ دەردەچی _ لادەچێ لە شوێنەکەی _)) .

(صەحیحە) (حم ، د) لە مەعاویەوە گێڕاویانەتەوە . صەحیحی ئەبی داود ١٠٣٤ . ئیروا ٤٤٤ : م .

٢٩٦ _ ٥٤٥٥((لِيُصلِ أحَدُكُم نشاطَهُ ، فإذا كَسَلَ او فَتَرَ فَلْيَقعُدْ)) .

(صحيح) (حم ، ق ، د ، ن ، هـ) عن انس صحيح ابي داود ١١٨٥ .

### ماناى فەرموودەكە

٢٩٦ _ ٥٤٥٥((با هەریەکێکتان بەچالاکی نوێژ بکا ، کە تەمبەڵ بوویان بێ هێز بوو با دابنیشێ)) .

(صەحیحە) (حم ، ق ، د ، ن ، هـ) لە ئەنەس گێڕاویانەتەوە . صەحیحی ئەبی داود ١١٨٥ .

موناوی فەرموویەتی : لەکاتی چوستی و چالاکی دا با نوێژ بکا هەرکەسێك کە نوێژ دەکا ، خۆ ئەگەر لەکاتی وەستانی بە پێوە تەمبەڵی یاخود تاقەتی چوو با دابنیشێ ، بەدانیشتنەوە نوێژەکەی تەواو بکا ، یان ئەگەر دوای سەلام دانەوەێ لەفەرزەکە بێ تاقەت بوو با سوننەتەکان بەدانیشتنەوە بکات ، یاخود ئەگەر لە ناو نوێژە سوننەتەکەدا بێ هێز بوو با ئەو نوێژە بپچڕێنێ ، تا ئەو بێ هێزیەی نامێنێ و بەگوڕدێتەوە .

٢٩٧ _ ١١٥١((آقتلوا الحَيّة والعَقْرَب وإنْ كُنْتُم في الصَّلاةِ)) .

(صحيح) (طب) عن إبن عباس صحيح ابي داود ٨٥٤ .

### ماناى فەرموودەكە

٢٩٧ _ ١١٥١((مار و دووپشك بكوژن ئەگەر چی لەنوێژیشدا بن)) .

(صحیحە) (طب) لە ئیبنو عەبباس گێڕاویەتیەوە . صحیحی ئەبی داود ٨٥٤ .

موناوی فەرموویەتی :خاوەنی ((کەشاف)) فەرموویەتی : (الحیە) ناوێکی ڕەگەزیەو نێرو مێ و گەورەو بچووك دەگرێتەوە ، نەك هەر ئەم دووە _ مار _ دووپشك _ بەڵکو هەرچی زیان داربێ دەیگرێتەوە وەکو زەردەواڵە _ ئەوانەش کوشتنیان لەنوێژدا ڕێی پێ دراوە .

## ٥٥ _ سوجدەی شوکر و سوجدەی تیلاوەت .

٢٩٨ _ ٤٧٠١((كانَ إذا جاءَهُ أمرُ يُسرَّبهِ خَرَّ ساجِداً شُكراً لِلهِ تَعالىٰ)) .

(حسن) (د ، هـ) عن ابي بكرى . المشكاة ١٤٤٩ .

### ماناى فەرموودەكە

٢٩٨ _ ٤٧٠١((کاتێك کە کارێکی _ هەواڵێکی _ دڵخۆشکەری پێ گەیشتبایە و دڵخۆشبا پێی کڕنووشی دەبرد _ وەکو _ سوپاسێك بۆ خودای تەعالا)) .

(حەسەن) (د ، هـ) لە ئەبی بەکرەوە گێڕاویانەتەوە . میشکات ١٤٤٩ .

موناوی فەرموویەتی : سوننەتە سوجدەی شوکر بردن لە کاتی بەدەست کەوتنی نیعمەتێك یاخود هەر شتێك کە ببێتە مایەی دڵخۆش کردن ، هەر کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) تووشی یەکێك لەوانە بوایە دەست بەجێ سوجدەی شوکری دەبرد ، یاخود _ لەکاتی _

لەدەستدانی هەر شتێك كە ببێتە مایەی دڵتەنگی سوننەتە سوجدەی شوكر ببردرێ ، چونكە سوجدە بردن ئەو پەڕی زەلیلی و بێ دەستەڵاتی بەندەیە بەرامبەر بە خوا .
وە شێوازی سوجدەكە یەك سوجدەیە بەبێ سەلامدانەوە ، بە دەست نوێژەوە بێ یاخود بەبێ دەست نوێژ جیاوازی نیە .

**٢٩٩ _ ٥٦٤((إذا رَأيتمُ آيةَ فَاسْجُدوا)) .**

(صحيح) (د ، ت) عن إبن عباس . صحيح السنن ١٠٨١ ، المشكاة ١٤٩١ .

## مانای فەرموودەکە

٢٩٩ _ ٥٦٤((كاتێك كەنیشانەیەكتان بینی كڕنوش بەرن)) .

(صەحیحە) (د ، ن) لە ئیبنو عەبباس گێڕاویانەتەوە . صەحیحی سوننەن ١٠٨١ ، میشكات ١٤٩١ .

موناوی فەرموویەتی : كاتێك كەنیشانەیەكتان بینی بەڵگە بوو لەسەر لە دەست دانی ڕەحمەت و هاتنی بەڵاو موصیبەت ، وەكو مردنی پێغەمبەر (ﷺ) یاخود خێزانەكانی ، لەبەر ئەوەی ئەوان خاوەنی بەرەكەتن و بۆ ئێمە لە ڕاگەیاندنی شەریعەت كە ئەوەی پیاوان ناتوانن بیزانن (طیبی) فەرموویەتی (إذا رأیتم آیة فأسجوا) بەگشتی مەبە ستی پێ هەموو نیشانەیەتە لەخۆرگیراو مانگ گیران ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سوجدەی شوكر بردن لەكاتی تەنگانەو نارەحەتی .

**٣٠٠ _ ٧٢٧((إذا قرأ إبنُ آدمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ ، إعْتَزَلَ الشيطانُ يَبْكي يَقول ياوَيْلَهُ أمر إبن آدم بالسجودِ فَسَجَدَ فلَهُ الجنة ، وأُمِرتُ بِالسجودِ فعَصَيْتُ فِليَ النار)) .**

(صحيح) (حم ، م ، هـ) عن أبي هريرة . اصلاح المساجد ٦٩ ، مختصر مسلم ٣٦٩ .

## مانای فەرموودەکە

٣٠٠ _ ٧٢٧((كاتێك كەبنیادەم _ ئایەتی _ سەجدەی خوێند سوجدەی برد ، شەیتان _ ئیبلیس _ دوور دەكەوێتەوە ودەگری و دەڵێ : وای بۆمن بنیا دەم فەرمانی پێكراوە بە كڕنوش بردن كڕنووشی برد و بەهەشتی بۆ هەیە ، وە منیش فەرمانم پێكرا بەكڕنووش بردن سەر پێچیم كرد ئاگرم _ بەشە _ بۆ هەیە)) .

(صەحیحە) (حم ، م ، هـ) لە ئەبی هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە . ئیصلاح و لمەساجید ٦٩ ، موختەصەری موسلیم ٣٦٩ .

موناوی فەرموویەتی : كاتێك كە بنیادەم ئایەتی سوجدەی خوێند و سوجدەی تیلاوە _ قورئان خوێندنی _ی برد شەیتان دوور دەكەوێتەوە و دەگرێ و دەڵێ : ئای لەو خەم و مەراقەو بە پەند چوونە ، بنیادەم فەرمانی پێكرا كە كڕنۆش بەرێ و كڕنۆشی برد ، بەوەش كە گوێڕایەڵی خوای كرد ، بەهەشتی بۆ هەیەو بەشیەتی ، وەمنیش فەرمانم پێ

کرا بە کڕنۆش بردن ، بەڵام من خۆم بەزل گرت و سەرپێچیم کرد و کڕنۆشم نەبرد ، بۆیە ئاگر بەشمە لە ڕۆژی دواییدا هەر ئەوم بۆ هەیە ئەم فەرموودەیە گەورەیی سوجدەی تیلاوەتی تێدا بەدی دەکرێ ، سوجدەی تیلاوەت یەك سوجدەیە و سوننەتەلە نوێژی فەرزو سوننەتدا ببردرێ کاتێك قورئان خوێنراو باسی سوجدەی تێدا بوو ، وە لە غەیری نوێژیش دەبردرێ لە هەموو کاتێکدا _ تەنها لەو کاتانەدا نەبێ کە نوێژ کردن تێیاندا مەکروهە و دروست نیە _ بەدەست نوێژەوە بێ یاخود بەبێ دەست نوێژی درووستە ، وە ڕووەو قیبلە بێ یا نا هەر درووستە ، وە لە قورئاندا چواردە سوجدە هەیە ، یەکەمیان لە کۆتایی سورەتی (الاعراف ٢٠٦) و پاشان لە (الرعد ١٥) و پاشان لە (النحل ٤٩) و پاشان لە (الاسراء ١٠٧) و پاشان لە (النمل ٣٥) و پاشان لە السجده ١٥٥) و پاشان لە (ص٢٤) و پاشان لە (فصلت ٣٧) و پاشان لە (النجم ٦٢) و پاشان لە (الانشقاق ٢١) و پاشان لە العلق ١٩) دا .

**٣٠١ _ ٣٦٨٢((السجدة التي في(ص)سَجَدها داود توبةً ، ونحن نَسْجُدَها شكراً)) .**

(صحيح) (طب ، قط) عن إبن عباس . المشكاة ١٠٣٨ : ن ، قط .

### مانای فەرموودەکە

٣٠١ _ ٣٦٨٢((ئەو کڕنۆشەی کەلە سورەتی _ص دایە داوود ئەو کڕنۆشەی برد لەبەر قبوڵ بوونی تەوبەکەی وە ئێمە کڕنۆشەکە دەبەین _ وەکو _ شوکر کردن)) .

(صەحیحە) (طب ، قط) لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاویانەتەوە . میشکات ١٠٣٨ : ن ، قط .

موناوی فەرموویەتی : ئەو سوجدەیەی کەلە سورەتی ص دایە پێغەمبەری خودا داوود (علیه الصلاه والسلام) بردی وەکو سوپاسێك بۆ خوا لەسەر ئەوەی کەتەوبەکەی قبوڵ کرد ، هەر وەکو لەریوایەتی تردا هاتووە (ونحن سجدها شكراً لله) وە ئێمە ئەو سوجدەیە دەبەین وە سوپاسێك بۆ خوا لەسەر قبوڵ بوونی تەوبەی پێغەمبەرەکەی : هەڵبەتە زۆر شت وتراوە دەربارەی داود (علیه الصلاه والسلام) کە هەموویان لەڕاستییەوە دوورن ، لەگەڵ مەقامی پێغەمبەرایەتی دا ناشێن ، وە ئیمام شافعی _ ڕەحمەتی خوای لێ بێت _ فەرموویەتی : ئەو سوجددەیەی سورەتی (ص) سوجدەی شوکرە نەك سوجدەی تیلاوەت .

**سوپاس بۆ خوا بەشی سێیەمی بژاردە کۆتایی پێهات و چاوەڕێی بەشی چوارەم بن کە لە ( سەجدەی سەهو )ەوە دەست پێ دەکات .**

| هێماكان | ( ناوی كتێبەكان و خاوەنەكانیان ) |
|---|---|
| ١-(خ) | صەحیحی ئیمامی بوخاری |
| ٢-(م) | صەحیحی ئیمامی موسلیم |
| ٣-(ق) | هی بوخاری و موسلیم |
| ٤-(د) | سونەنی ئەبی داود |
| ٥-(ت) | سونەنی ترمزی |
| ٦-(ن) | سونەنی نەسائی |
| ٧-(هـ) | سونەنی ئیبن ماجە |
| ٨-(٤) | هی ئەو چوار سونەنەی سەرەوە |
| ٩-(٣) | هی ئەوان تەنها ئیبن ماجە نەبێ |
| ١٠-(حم) | موسنەدی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل |
| ١١-(عم) | عبد الله ی كوڕی ئەحمەد |
| ١٢-(ك) | موستەدرەكی حاكم |
| ١٣-(خد) | (الأدب المفرد) هی ئیمامی بوخای |
| ١٤-(تخ) | (التأريخ) هی ئیمامی بوخاری |
| ١٥-(حب) | صەحیحی ئیبنو حەببان |
| ١٦-(طب) | طەبەرانی لە (الكبیر) دا |
| ١٧-(طس) | طەبەرانی لە (الأوسط) دا |
| ١٨-(طص) | طەبەرانی لە (الصغیر) دا |
| ١٩-(ص) | سونە نی سەعیدی كوڕی مەنصور |
| ٢٠(ش) | موصەنەفی ئیبنو ئەبی شەیبە |
| ٢١-(عب) | موصەنەفی عبدالرزاق |
| ٢٢-(ع) | موسنەدی ئەبی یەعلا |
| ٢٣-(قط) | دار القطني |
| ٢٤-(فر) | (مسند الفردوسی) هی دەیلەمی |
| ٢٥-(حل) | (حلیة الأولیاء) هی ئەبی نوعەیم |
| ٢٦-(هب) | (شعب الأیمان) هی بەیهەقی |
| ٢٧-(هق) | سوننەنی بەیهەقی |
| ٢٨-(عد) | (الكامل) هی ئیبنو عودەی |
| ٢٩-(عق) | (الضعفاء) هی عوقەیلی |
| ٣٠-(خط) | ـی خطیبی بەغدادی |
| ٣١-(و) | وەرگێر |

# نـــاوەرك

بـــابەت ـــــــــــ لاپەڕ